# ڕووبەڕوو لەگەڵ
# لەتیف هەڵمەتدا

دیداری:
شەمێران سلێمان

ڕووبەڕوو لەگەڵ لەتیف هەڵمەتدا

دیداری: شەمێران سلێمان

2011

پێشکێشه:

به خزمه‌تکارانی ئه‌ده‌بی کوردی و ئه‌و مامۆستایانه‌ی (ئه‌لفوبێ)ی کوردی فێری خوێندکارانی کورد ده‌که‌ن.

به هاوسه‌ره‌که‌م و کچه‌که‌م "شاریا".

# ڕووبەڕوو لەگەڵ لەتیف هەڵمەتدا

دیداری:

شەمێران سلێمان

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

هەولێر – هەرێمی کوردستانی عێراق

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
شەقامی گوڵان - هەولێر
هەرێمی کوردستانی عێراق
هەگبەی ئەلیکترۆنی aras@araspress.com
وارگەی ئینتەرنێت www.araspublishers.com
تەلەفۆن: 35 49 224 66 (0) 00964
دەزگای ئاراس لە ٢٨ تشرین (٢) ١٩٩٨ هاتووەتە دامەزران

ڕووبەڕوو لەگەڵ لەتیف هەڵمەتدا - دیدار
دیداری: شەمێران سلێمان
کتێبی ئاراس ژمارە: ١١٠٩
چاپی یەکەم ٢٠١١
تیرێژ: ١٠٠٠ دانە
چاپخانەی ئاراس - هەولێر
ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ٢٠٢ - ٢٠١١
نەخشاندنی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
ڕازاندنەوەی بەرگ: مریەم موتەقییان
هەڵەگری: فەرهاد ئەکبەری، بۆکان نووری سەعید

# پێشەکی

گفتوگۆکردن لەگەڵ هەر شاعیرێک، یان هەر نووسەر و رۆماننووس و ئەدیبێک کارێکی ئاسان و بێ کەموکوڕی نابێت، بەتایبەتی ئەگەر بمانەوێ ئەو گفتوگۆیە گشتگیر بێت و زۆربەی کایەکانی ئەدەبی داهێنەر و لایەنەکانی تری ژیانی بگرێتەوە، ئەوا بۆ کەسێکیش کە قۆناخی سەرەتاییی تەمەنی کاری رۆژنامەوانی بێت و ماوەیەکی زۆر نەبێت ئاشنا بووبێت بە کاری رۆژنامەوانی و سازدانی چاوپێکەوتن لە بواری ئەدەب، لەبەرئەوە سازدانی ئەم جۆرە دیدارە دوور و درێژانە کارێکی قورستر دەبێت بۆی ئەمە لەلایەک، لەلایەکی ترەوە لەبەرئەوەی کاری لەم شێوە لە ئەدەبی کوردیدا زۆر کەمە و نەبوونی شارەزاییی تەواو لەم جۆرە کارانەدا تا رادەیەک ئاڵۆزی دەکات.

خانی لە مەم و زینەکەیدا ئاماژەی بەوە کردووە کە لەبەرئەوەی لە مێژووی پێش خۆیدا کاری لەو شێوەی ئەو کردوویەتی بوونی نەبووە تا ببێتە رێنیشاندەرێک بۆی و بتوانێت سوودی لێ ببینێت، رەنگە بەرهەمەکەی کەموکوڕیی تێدا بێت، پێ دەچێ نەبوونی ئەزموونێکی دەوڵەمەندی هاوشێوەی ئەم کارەی منیش گرفتێک بێت لە بەردەممدا کە ئەم کارەم بێ کەموکوڕی بگەیەنمە ئەنجام، هەر لەبەر ئەو هۆکارانە پرۆژەی ئەم کتێبەی من بێ کەموکوڕی نییە.

شاعیرێکی گەورەی نوێخوازی وەکو لەتیف هەڵمەت کە هەر لە سەرەتاکانی تەمەنییەوە تا ئێستاش خزمەتی وێژەی کوردی کردووە و بۆ ساتێکیش بێت لەو مەیدانەدا ماندوو نەبووە و خاوەنی زیاتر لە چل کتێبی دیوانە شیعر و شیعری منداڵان و لێکۆڵینەوە و چیرۆک و نووسینە، هەروەها بەدامەزرێنەری گرووپی کەرکووک - کفریش دادەنرێت کە لە ساڵانی کۆتاییی شەستەکانی

سەدەی رابردوودا لەگەڵ کۆمەڵێک شاعیری تری وەکو فەرهاد شاکەلی هەوڵی جیدیان داوە بۆ نوێکردنەوەی شیعری کوردی و خۆشبەختانە هەوڵەکانیان ئەنجامی باشی لێ کەوتەوە بۆ گەشەدان بەئەدەبی کوردی شانبەشانی ئەدەبی وڵاتانی تر کە دەبێ هەموو کات بەچاوی رێزەوە لە هەوڵەکانی ئەم شاعیرە گەورەیەی میللەتەکەمان بڕوانین، چونکە کارە ئەدەبییەکانی کاک لەتیف هەڵمەت هەر لە کۆتاییی شەستەکان و سەرەتای حەفتاکانەوە گوڕێکی تری دا بە بەراکردنەوەی گیانێکی نوێ بە شیعری کوردی دا و بازدانێکی گەورە و بوێرییەکی سەرکێشانە بوو کە مێژوویەکی گەشاوەی بۆ خۆی دروست کرد و خزمەتێکی کەموێنەی بواری شیعری کوردی کردووە و دەکات لە ڕووی تەکنیک و هونەر و شێواز و ناوەڕۆکەوە و بەکارهێنانی چەند هونەرێکی تری وەکو پەیکەرسازی و وێنەکێشان بۆ زیاتر جوانکردنی وێنەی شیعری لە شیعرەکانیدا ، لەبەرئەوە گفتوگۆکردن لەگەڵ شاعیرێکی وادا سەرەڕای ئەوەی خزمەتکردن و رێزگرتنە لە کارە داهێنەرەکانی نووسەر و شاعیرێکی وەکو کاک لەتیف هەڵمەت خزمەتکردنیشە بە وێژەی نەتەوەکەم، بەهیوای ئەوەی توانیبێتم کارێکی لە ڕووی چۆنیەتییەوە باشم کردبێ.

ئەوەی لێرەدا ویستوومە بیکەم بەناوەڕۆکی ئەم کتێبە کۆمەڵێک لایەنی جیاواز و فرە چەشنی کارە ئەدەبی و داهێنەرەکانی شاعیرە لەبارەی دنیای بەرینی شیعر و فۆرم و ناوەڕۆکی شیعری و خۆشەویستی و خوێندنەوە و کتێب و دید و بۆچوونی ئەم شاعیرەیە سەبارەت بەڕەوتی ئێستای ئەدەبی کوردی و تیشک خستنەسەر لایەنەکانی تری وەکو لەچاپدان و وەرگێڕان و رەخنە و... هتد، هەروەها سەبارەت بە ژیانی تایبەتی و دوور لە ژیانی ئەدەبی شاعیرم هێناوەتە دوان بەگێڕانەوەی بیرەوەرییەکانی منداڵی و گەنجێتی و هاوڕێیەتی و خولیا و ئارەزووەکانی، کە ئەمەش بۆ ئەو کەسانەی بیانەوێت شارەزایی لەبارەی هەموو ئەو لایەنانەی ژیانی شاعیر بزانن سوودمەند دەبێت.

زنجیرەی گفتوگۆکەمان بەشێوەیەکی گشتی لە تەمەنی منداڵییەوە دەستی

پێ کردووە و هەوڵم داوە بەشێوەی یەک لە دوای یەک باس لە ژیان و بەرهەم و هەموو ئەو بابەتانەی تریش بکەین کە لە ئەنجامی گفتوگۆکەمان خۆی سەپاندووە و تێهەڵکێشم کردوون.

لە کۆتاییدا دەمەوێ زۆر سوپاسی کاک لەتیف بکەم بۆ ئەو لەخۆبووردەیی و پەرۆشییەی کە هەر لە سەرەتاوە نیشانی دا کە دەیەوێ ئەو پێشنیازەی من خستمە بەردەستی و ئەم کتێبەی لێکەوتووەتەوە ئێستا لە بەردەستتدایە سەربگرێت، بەخۆشحاڵیشەوە کە ئەوەی لە سەرەتاوە پێکەوە کارمان بۆ کرد هاتە دی و تا دواسات هاوکارێکی باشم بوو کە زۆر جێگەی دەستخۆشییە، من سوپاس و پێزانینی خۆم پێ رادەگەیەنم.

شەمێران سلێمان

٢٠٠٩-٩-١٥

## منداڵی

* سەرەتا دەمەوێ لە سەردەمی ژیانی منداڵیتەوە و لەو پرسیارەوە دەست پێ بکەم لەبارەی ئەوەی ئەو ژیاننامەیەی کە خۆت نووسیوتە و لە رۆڤار بڵاوت کردووەتەوە ساڵی لەدایکبوونی خۆت دەستنیشان نەکردووە، بۆچی؟.

– ئەگەر باسی منداڵیی خۆم بکەم، رەنگە منداڵی من لە منداڵیی زۆر لە رۆشنبیران و شاعیرانی کورد جیاواز بێت، من لە ماڵێکا لەدایک بووم، ماڵێکی ئاینپەروەری رۆشنبیر، پڕ لە کتێب، هەر کە فێری خوێندنەوە بووم، کتێبخانەکەی باوکم رووبەڕووم بووەوە، جگە لە قورئانی پیرۆز، لەو کتێبخانەدا گەلێ کتێبی تری وەکو چیرۆکی پێغەمبەران و ئینجیل بە کوردی و مەسنەوییەکانی جەلالەدینی رۆمی و دیوانی حافیزی شیرازی و بووستان و گوڵستانی سەعدیی شیرازی و هەندێک لە شیعرەکانی فەریدەدینی عەتار وەکو پەندەکانی فەریدەدینی عەتار، هەروەها دیوانی هەندێ لە شاعیرانی کورد، وەکو دیوانی مەولەوی، جگە لەوەش باروذۆخی ماڵمان جگە لەوەی کە کتێبخانەکەی تێدا بوو، شەوانی هەینی لە ماڵی ئێمەدا قەسیدەی بوردیە دەخوێنرایەوە، واتە ئەو چامە درێژەی کە ئەلبوسەیری نووسیوویەتی و لە شێوەی مەولا یاسەلی دەخوێنرێتەوە، ئەو ریتم و رەزمی مەولا یاسەلێیەی کە باوکم و هەندێ لە ئامۆزاکانم و خوشکەزاکانی باوکم لەگەڵ هەندێ دراوسێ و مەلا و شێخی خزم و هاورێ و ناسیاوی باوکما کە شەوانی هەینی دەیانخوێندەوە، بارودۆخێکی روحانیی سەیری خستبووە ماڵمانەوە، کە ئەو بارودۆخە لە هەموو ماڵێکدا نەبوو.

* کەواتە ژینگەیماڵتان هەر لە منداڵییەوە یارمەتیدەر بووە بۆ ئەوەی کە تۆ ببی بە شاعیر و نووسەرێک وەک ئەوەی کە ئێستا هەیت؟

– بەراستی دەڵێم، دەبوو من هەر ببم بە شاعیر و نووسەر، چونکە من هەموو کات باوکم دەبینی قەڵەمێک و دەفتەرێکی پێ بوو شیعری دەنووسی، یان خەریکی نووسینەوەی کتێبێک بوو، بەداخەوە ئەو کتێبەی باوکم ون بوو، کتێبێکی عەرەبی بوو بە ناوی (کأسا دهاقا).

* لەو کتێبەدا باوکت باسی چی دەکات؟

– باوکم لەو کتێبەیا بەرگری زۆر لە هەڵوێستەکانی ئیمامی عەلی دەکات دژی هەڵوێستەکانی بەنی ئومەیە و مەعاویە و ئەوانەی کە لایەنگری مەعاویە بوون، باوکم لەو کتێبەیا زۆر بەچاوقایمی و پێداگرییەوە و شیعانە بیری دەکردەوە و پشتگیریی لە هەڵوێستەکانی ئیمامی عەلی دەکرد و لەو کتێبەیا ئەوەی خستبووە روو کە دەبوو ئیمامی عەلی لە دوای پێغەمبەر خەلیفە بێت نەک یەکێکی تر.

* پیم وابێ شتێکی شازە ئەگەر پیاوێکی دینیی سوننی بەرگری لە شیعە بکا.

– بەڵێ، ناتوانم بڵێم ئەمە شتێکی دەگمەنە، بەڵام ئەمە هەڵوێستی راستی باوکم بوو، کتێبەکەی تەواو کرد، لە رێگەی هاورێیەکی خۆیەوە کە ئێستا لە کەرکووکە (سەید حەسەنی پاڵەوان) کە کاتی خۆی یەکێک بووە لە وەرزشوانانی کەرکووک و خەلات و مەدالیای باشی بەدەست هێناوە، لە رێگەی ئەو سەید حەسەن پاڵەوانەوە کە بەجۆرێ لە جۆرەکان خزممانە، ئەو کتێبەی گەیاندە چاپخانەیەک، یان لە نەجەف بوو، یان لە کەربەلا، زۆر بەگەرمییەوە پێشوازی لە کتێبەکەی کرا، بەڵام بەداخەوە ئەو چاپخانەیەی کە

کتێبەکەی باوکمی لێ بوو لە برا کوردە فەیلییەکان بوون، کاتێک ڕاگوێزران کتێبەکەی باوکیشم تیاچوو، شایانی باسە لە هەشتاکاندا ماڵی باوکم لە کەرکووک ڕاگوێزران و هەموو کتێب و دەستنووسەکانی باوکم فەوتان.

* یەعنی بە ئەنقەست نەبوو؟

- بەڵێ تیاچوونی ئەو کتێبە بە ئەنقەست نەبوو، بەهۆی ڕاگواستنیانەوە بوو، زۆرمان پێ ناخۆش بوو، دەتوانم بڵێم باوکم بەهۆی ئەوەوە نەخۆش کەوت و هەندێ حاڵەتی نائاساییی تووش بوو، من وا هەست دەکەم هەر بەو داخەوە مرد، چونکە تەمەنی خۆی لەو کتێبەیا بەسەر برد، ئێستا هەندێ لە برگەی ئەو کتێبە بەشێوەی شیعر بە کوردی ماوە و هەندێکی لەلای منە، هەندێکی تری لای کوڕێکی ئامۆزامە.

* تا ئێستا بڵاوتان نەکردووەتەوە؟

- تا ئێستا بڵاومان نەکردووەتەوە، چونکە بارودۆخێکی وا نەلواوە ئێمە بتوانین لەو ئیملا کوردییەی باوکم ئیش بکەین، بە ئیملای کۆن نووسیویەتی بە کوردیی ساڵانی پەنجا و شەستەکان نووسیویەتی.

* ئەو کات ڕێنووسی کوردی ئاڵۆز بووە، زۆر نیزیک بووە لە ڕێنووسی عەرەبی.

- بەڵێ ڕێنووسێکی عەرەبی بووە.

## لەدایکبوونی لەتیف هەڵمەت

* پێش ئەوەی ماڵتان بچێتە کفری تۆ لەدایک نەبووبووی؟

- باپیرە گەورەم خەڵکی کەسنەزانی قەراخە، بۆ بڵاوکردنەوەی ڕێبازی قادری چووە بۆ گەرمیان و دەتوانم بڵێم لە زۆربەی لادێکانی گەرمیان، تەکیەمان

هەبووە لەناو جاف و زەنگنەدا بەتایبەتی ئاوایی رەمەوان، کەریم باسام، زۆراو بەگزاوە و سماق، هەوارە قوولە و ئاوباریک تەکیەمان بووە، ئیتر یەکێ لە کوڕەکانی باپیرم کە باوکم بوو، لە کفری نیشتەجێ بوو، هەر ئەو ساڵەی کە باوکم چووەتە کفری من لەدایک بووم.

* ساڵی چەند؟

– ئەو ساڵە ئەگەر بە ناسنامە بێت ساڵی ١٩٤٧، بەلام، ئەگەر بە بەڵگەنامەکان بێت کە من دەستم کەوتەوە ١٩٥١ لەدایک بووم.

* ئەی هیچ بیرەوەرییەکی منداڵیت لە بیرە لە کفری و لەگەڵ هاوڕێکانت و یاریکردن و هەر شتێ بێت؟

– وەلایی ئەوەی لە بیرم بێت لەگەڵ هاوڕێکانما لە دەرەوە زۆر حەزم لە یاری بوو، بەلام شەوان باوکم لەگەڵ هەندێ دەروێش و مەلا و شێخی خزممان‌دا دادەنیشتن، باوکم شیعری حافیزی شیرازی و سەعدی شیرازی و جەلالەدینی رۆمی و فەریدەدینی عەتار و بایەزیدی بەستامی بە فارسی دەخوێندەوە و بۆیانی راڤە دەکرد و منیش دادەنیشتم و گوێم لێ دەگرت.

* یەعنی دەتوانین بڵێین تۆ بەرۆژدا وەکو منداڵێک لە دەرەوەی ماڵ یاریت کردووە و بە شەوانیش وەکو کەسێکی گەورە لەگەڵ خوالێخۆشبووی باوکت لە کۆبوونەوەی رۆشنبیری و لەگەڵ گەورەکاندا دانیشتووی بەشداری ئەو کۆڕانە بوویت؟

– من هەر بە منداڵی لە کۆڕی شیعردا چاوم هەڵهێناوە و گەورە بووم، لەگەڵ ئەوەشا منداڵێتیی خۆمم ون نەکردووە لەگەڵ منداڵانی هاوڕێی خۆمدا هەموو جۆرە یارییەکم کردووە، بەلام من زیاتر حەزم لە کۆلارە بوو، یەکێک بووم لەوانەی کە کۆلارەیەکی زۆر دەگمەنم دروست دەکرد و گەلێ لە منداڵانی هاوڕێم دەهاتن بۆ لام و داوایان لێ دەکردم کە کۆلارەیان بۆ دروست بکەم،

بەڵام ئەوەی راستی بێت کۆلارەی هیچ کەسێکم وەکو ئەوانەی خۆم دروست نەدەکرد.

* بۆچی؟

- یەعنی حەزم دەکرد کۆلارەکەی خۆم لە هی هەر هەموویان چاکتر بێت، وەکو چۆن ئێستا حەز دەکەم شیعری خۆم لە شیعری هەمووان چاکتر بێت، کە ئەوەش حەقی خۆمە، ئەوساش حەقی خۆم بوو، من کۆلارەیان بۆ دروست بکەم، وەکو ئەوەی هاورێمن و منداڵن، بەڵام حەقی خۆشم بوو کە کۆلارەیەکیان بۆ نەکەم، وەکو کۆلارەکانی خۆم.

## چوونە بەرخوێندن

* بەپێی تەمەنەکەت بێت تۆ لە ناوەڕاستی پەنجاکانا چوویتەتە بەر خوێندن، یەعنی هەر لەوێش ئاشنا بووی بە شیعر؟

- خوا ئاگەدارە من بناخەی خوێنەواری و رۆشنبیری و شاعیریم لە ماڵەوە دەستی پێ کردووە و قەرزاری باوکم و کتێبخانەکەی باوکم بووم، بیرم نەبوو شتێکی تر بڵێم لە کتێبخانەکەی باوکما کۆمەڵێ کتێبی ئەفسانەیی هەبوو وەکو شیرین و فەرهاد، خورشید و خاوەر، لەیلا و مەجنوون، رۆستەم و زۆراب، رۆستەم و جیهانگیر، مەنیجە و بێژەن، غەزای بەدرلحونەین، حەیدەرنامە کە باسی ئازایەتیی ئیمامی عەلی دەکات، یەعنی ئەمانە دنیایەکی ئەفسانەییان بۆ دروست کردم لە پاڵ کتێبی (ئەلف لەیلە وەلەیلە) کە هەر لە کتێبخانەکەی باوکمدا هەبوو، جگە لەوەش هەندێ گۆواری کوردی وەکو گەلاوێژ ئەمە باسی شەستەکان دەکەم ژمارە کۆنەکانی گەلاوێژم دەبینی لەلای باوکم.

* ئەو کات خوێندن بەزمانی عەرەبی بووە، تۆ وەکو خوێندکارێکی کورد خوێندن بە عەرەبی قورس نەبوو؟

- من له شارێکا بووم کورد و عەرەب و تورکمانی تێدا دەژیا، هەر هی ئەوەشە بەزارەکی تورکمانییەکی باش دەزانم و هەر لە سەرەتاییەوە خوێندن بە عەرەبی بوو...... ئەو دەمە ئێمە وامان دەزانی خوێندنی قوتابخانە دەبێ هەر بە عەرەبی بێ.

* تۆ دەڵێی بەزارەکی تورکمانی دەزانم، ئەی بە نووسین؟

- وەڵایی بە نووسین ئەوان جیاوازن، پیتی لاتینییان هەیە و پیتی عەرەبییان هەیە و پێویستیشم بەوە نەبووە بە تورکمانی شیعر بنووسم، بەڵام پێویستیم بەوە بووە گفتوگۆ و دواندن لەگەڵ هاوڕێ منداڵەکانما بە تورکمانی بکەم، یا زۆرجار لە قوتابخانەیا راڤەی وانەکان بە تورکمانی بوون، یەعنی با بڵێین کتێبەکان بە عەرەبی بوون مامۆستاکان تورکمان بوون، ئێمە ناچار بووین راڤەی وانەکان بە تورکمانی بکەین، ئەوەش یارمەتیدەر بووە بۆ ئەوەی فێری تورکمانی ببم، من تا ئێستاش خشتەی لێکدانم بە تورکمانی لەبەرە، بەکوردی نایزانم، ئەمەش ئەوە ئەگرێتەوە کە ئەو ناوچەیەی ئێمە نەک هەر تەعریب کرابوو، بگرە تەتریکیش کرابوو، ئێمە خۆمان وەکو عەشقێکی کوردایەتی، یان وەکو خەبات و تێکۆشانێکی کوردایەتی من خۆم فێری زمانی کوردی کردووە و لە شارێکدا کە تەعریب و تەتریک کراوە، هاتووم بە کوردی نووسیومە و شیعرم بە کوردی ناردووە بۆ ئێستگەی کوردی بەغدا و ناردوومە بۆ هەندێ رۆژنامە و گۆواری ئەو سەردەمە وەکو گۆواری رزگاری کە لە کۆتایی شەستەکاندا لە سلێمانی دەردەچوو.

## گۆواری رزگاری

* ئەوە باسی گۆواری رزگاریت کرد، یەکەم جار کە هۆنراوەت نارد بۆ گۆواری رزگاری بڵاو نەبووەوە، نازانی هۆکارەکەی چی بوو؟ بەهۆی کاڵوکرچی شیعرەکەتەوە بووە؟ چونکە تۆ سەرەتای نووسینی شیعرت بووە، یان هۆکاری تر بوو؟

– هۆکاری ئەوە بوو من نەناسرابووم، ئەگینا من هەمان شیعرم لە (خوا و شارە بچکۆلانەکەمان)دا بلاو کردووەتەوە و گەلێ برادەریش ئەوانەی شیعرناسن، دەستخۆشیی ئەو شیعرەیان لێ کردووم.

* کەواتە ناسراوی پێوەندیی بەوەوە هەیە بۆ بلاوبوونەوەی هەر بابەتێک لە هەر شوێنێک بتەوێ؟

– بێگومان ئەوساش و ئێستاش بوویەتی، بەلام با بیرم نەچێ، من بۆ دووەم جار دەقێکی ترم نارد بۆ کۆواری رزگاری، دەقەکە بانگەوازێک بوو بۆ شیعری نوێ و خۆشی شیعری نوێ بوو بلاویش بووەوە و بوو بە هاندەرێک بۆ ئەوەی زیاتر بنووسم و من توانیومە لە شارێکا کە تەعریب و تەتریک کراوە، دەقێکی کوردی بنێرم بۆ کۆواری رزگاری کە لە سلێمانی دەردەچوو و بەناوی خۆمەوە و کۆوارەکە هاتووە بۆ شارەکەم زۆرم پێ خۆش بووە.

## کفری

* کە بە یەکێک دەلێی خەلکی کوێی؟ دەگەڕێتەوە بۆ رەچەلەکی باو و باپیرانی و دەلێ خەلکی فلان شوێنم، باپیرت لە قەراخ بووە و خۆشت لە کفری لەدایک بوویت، خۆت بە خەلکی کفری دەزانی؟

– من خەلکی هەموو شوێنێکم، من خەلکی شاری وشەم، ئەگەر جیاکردنەوە بێ، بلێم خەلکی کفریم، ئەمە جیاکردنەوەی کفری بێت لە کوردستان، ئەمەم بەلاوە پەسەند نییە.

* نا وەکو جیاکردنەوە نا، وەکو شوێنی لەدایکبوون و ژیانی مندالیت و... هتد.

– من بە رەچەلەک و بنەچە باو و باپیرم خەلکی سلێمانییە.

* خۆت خەڵکی سلێمانیت یا کفری؟

- خۆم خەڵکی کفریم.

* تا پۆلی چەندت لە کفری خوێند، یان تا ساڵی چەند ماڵتان لە کفری بوو؟

- تەقریبەن تاکو ساڵی حەفتاکان لە شاری کفری بووین، ئیتر کفریمان بەجێ هێشت و چووین بۆ ناو خزمانمان بۆ کەرکووک، چونکە کۆمەڵێ ئامۆزا و پوورزا و مام و کەسوکاری زۆرمان لە کەرکووک بوون، ناڵێم لە کفرییش غەریب بووین، چونکە شەش حەوت ماڵی خزم لەوێ بەیەکەوە بووین، بەڵام وامان بەباشزانی نێزیکتر بینەوە.

* ساڵی چەند بوو؟

- وا بزانم ساڵی حەفتا بوو.

## خوێندنەوە

* دیارە ئەوەی کە تینووی خوێندنەوە بێت و لە ژینگەیەکی ئاوا رۆشنبیریا بژی دەبێ، حەزی خوێندنەوە زوو لای بپشکوێت، ئەو حەزە کەی بەتەواوی لای تۆ دەرکەت، حەزی خوێندنەوە و نووسین و خۆ رۆشنبیرکردن؟

- ئەو حەزە هەر لە کفرییەوە لای من دەرکەوت، لە هەشت نۆ ساڵییەوە، باوەڕت هەبێ من لە دوازدە ساڵیا خوێندومەتەوە و لە پازدە شازدە ساڵیا دیوانی بەدر شاکر سەیاب و عەبدولوەهاب بەیاتی و بلند ئەلحەیدەری و ئەدۆنیس و کۆواری شیعری لوبنانیم خوێندووەتەوە، ئەویش بەهۆی ئەو سەفەرانەوە کە بۆ ماڵە خزمەکانم بۆ کەرکووک دەمکرد، لەسەر شۆستەکانی کەرکووک، یا لە هەندێ کتێبخانە و بازاڕی عەسری کەرکووک کە کتێبخانەی

لێ بوو، وا بزانم هەندێ کتێبخانە کتێبی کۆنیان دەفرۆشتەوە من ژمارە کۆنەکانی (العاملون في النفط و اهل النفط و ادابي بيروتي و شیعری لبنانی) گەلێ دیوانی شیعری وەکو لوزوومیاتی مەعەڕی و دیوانی موتەنەبی و دیوانی ئەبونەواسم لێیان دەکڕی.

* بەڵێ ئەو کاتە کە ئەو شیعرە عەرەبییانەت لەو تەمەنەدا دەخوێندەوە، بەجوانی لێی تێ دەگەیشتی؟ بۆیە دەڵێم، چونکە زمانی نووسینی شیعر زمانێکی چڕ و قووڵە و... هتد.

– زۆر بەباشی لێیان تێ دەگەیشتم، چونکە جگە لەوەی خوێندنم بە زمانی عەرەبی بوو، لە ماڵیشەوە زۆربەی کتێبەکانی باوکم بە عەرەبی بوون و چیرۆکی پێغەمبەران (قصص الانبياء)م بە عەرەبی خوێندووەتەوە، زۆر بە باشی لێی تێ دەگەیشتم، هەروەها شتێکم لە بیر نەچێ من بۆ ئەوە لەدایک بووم، بخوێنمەوە و ببم بە شاعیر، ڕەنگە ئەنیشتاین بۆ ئەوە لەدایک بووبێ بۆ ئەوەی تیۆریی ڕێژەیی بدۆزێتەوە، هەر یەکە و بۆ شتێ لەدایک دەبێ، هەندێ کەس بۆ پێغەمبەرایەتی لەدایک دەبن، هەندێکی تر بۆ سیاسەت، یان بۆ ئیشی قورس.

## کتێب و کۆوار کڕین

* باسی ئەوەت کرد کە کاتێ بۆ سەردان چوویت بۆ کەرکووک لەوێ کتێب و کۆوارت کڕیوە، ئەی کفری کتێبخانەی لێ نەبوو، هەر چەند ئەو سەردەمە کتێب کەم بووە.

– نەخێر کتێبخانە لە کفری نەبوو، بەڵام بۆ مێژوو دەیڵێم، مزگەوتی حەنەفی هەبوو لە کفری لە سەرەتای بازاڕی کفریدا بوو، بازاڕی کفری بازاڕێکی قەیسەریی گەورە بوو، وەکو بازاڕە کۆنەکانی کۆیە و کەرکووک و سلێمانی و شارە گەورەکانی تر، بازاڕێک بوو هەموو دێهاتەکانی کفری roوویان تێ

دەکرد، لەوێدا، لە پاڵ مزگەوتی حەنەفیا، مەلا قادرێک هەبوو، مەلا قادری زەنگنە، ئەگەر ماوە یاخوا تەمەندرێژ بێ، ئەگەر نەشماوە، بە بەهەشت شاد بووبێ، کتێبی کوردیش و عەرەبیشی دەفرۆشت، کتێبێک کە قەت لە بیرم ناچێتەوە لە ناوەڕاستی شەستەکانا لەلای ئەو کڕیم، دیوانی مەولەوی بوو، بەشەرح و پەڕاوێزی مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیسەوە، کە زۆرم پێ خۆش بوو، ئەگەرچی نایشارمەوە من لەو سەردەمەیا کە مەولەویم خوێندەوە، ئەموت بە دڵم نییە.

* بۆچی شاعیرێکی گەورەی وەکو مەولەوی کە دەیان لێکۆڵینەوەی گەورە و نامەی ماستەر و... هتد،[ لەسەر نووسراوە] تەنانەت لە دەرەوەی کوردستانیش ناسراوە، بۆچی تۆ پێی کاریگەر نەبووی؟

- خۆ ئەگەر بڵێم هی شێوە زارەکەیەتی کە بە زاری هەورامی نووسیویەتی، هی ئەوە نییە، چونکە لە پەڕاوێزا، مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس (خوا لێی خۆش بێت) بە جوانی شەرحی بۆ کردبوو و وشە بەوشە لێک درابووەوە.

* خۆ پیرەمێردیش شیعری زۆری مەولەویی کردووە بەسۆرانی؟

- دواتر هەر لە ناوەندی شەستەکانا لە سەفەرێکمدا بۆ شاری سلێمانی ئەوەی پیرەمێردیشم دەست کەوت، بەڵام نازانم سەرنجی منی رانەکێشا، من رۆمانسییانە بیرم نەدەکردەوە، من نوێگەرانە بیرم دەکردەوە، ئەگەرچی گەلێ نوێگەری لە شیعری مەولەویا هەیە و گەلێ رۆمانسییەت لە شیعری مەولەویا هەیە، بەڵام شەکر کە دەیکەیتە چاوە شیرینە و کە دەیکەتە پاقلاوەوە هەر شیرینە و کە دەشیکەیتە ناو کوپێ شیریشەوە هەر شیرینە، هەیە شەکری ناو شیرەکەی پێ خۆشە، هەیە شەکری ناو پاقلاوەکەی پێ خۆشە، هەشە هی ناو چاکەی پێ خۆشە، هەشە حەز دەکات شیلەی شەکر بخوات، خۆ هەمووی هەر شەکرە، بەڵام لە خواردنی جیاوازادا بەکار هاتووە، منیش هەندێ شیعری کوردیم لاخۆش بووە، بەڵام من چی بکەم لەو بارودۆخەدا و ئێستا لەو

تەمەنەدا، ئەگەر شیعری مەولەوی نەیبزواندبێتم، ئەمە شتێکی زۆر ئاساییە، زیاتر شیعری عەرەبی دەیبزواندم، من یەکسەر سەرچاوە عەرەبییەکانم دەخوێندەوە.

وەکو باسم کرد، شیعری بەدر شاکر سەیاب و عەبدولوەهاب بەیاتی و ئەو قوتابخانە نوێگەرییەی شیعری عەرەبیم دەخوێندەوە، چ لبنانییەکانی پێش ئەدۆنیسیش ئیلیاس ئەبووشەبەکە، یان ئەوانەی تاراوگە وەکو" جەبران خەلیل جەبران و میخایل نیعمە و نەسیب عەریزە و کۆمەڵێکی تر لەوانە، ئەمانە زۆر کاریگەرییان هەبوو لەسەرم، سەرباری ئەوانەش مستەفا مەنفەلووتی و مستەفا سادق رافعی و تەها حوسێنیش بەتایبەتی (في الادب الجاهيلي)م خوێندەوە زۆر کاری تێ کردم.

* سەیری ئەو تەلەڤزیۆنەی بەرامبەرمان بکە، ژن و پیاوێکی پیرن تازە زەواجیان کردووە، وابزانم پیاوەکە مەوالیدی ١٩٣٩یە.

- سی و نۆ پیر نییە، هەیە لە بیست ساڵیا پیرە، بیرکردنەوەی پیرە، هەشە لە نەوەد ساڵیا گەنجە، چونکە بیرکردنەوەی گەنجە، با بیرمان نەچێ، ئەوەی بیرسترۆکای لە یەکەتیی سۆڤیەتدا ئەنجام دا و ژیانی لە سەرانسەری زەویدا گۆڕی، گەنج نەبوو، پیر بوو... هتد، گۆرباتشۆف لە تەمەنێکی پیریدا توانیی بیرسترۆکا لە یەکەتیی سۆڤیەتا ئەنجام بدا و مێژووی مرۆڤایەتی بگۆڕێ.

* زیاتر مەبەستم ئەو جۆرە زەواجە بوو لەو تەمەنەیا چیت لا دروست دەکا؟

- زۆر شتێکی ئاساییە، لە بیرمان، نەچێ هەتاو کۆنە، یەعنی ملیۆنەها ساڵە هەتاو هەڵدێت و ئاوا دەبێت، هاوسەرگیری مافی رەوای هەر کەسێکە لە هەموو تەمەنێکدا و، بیرت نەچێ رۆڤائیل ئەلبێرتی ٤٤ ساڵ لە هاوسەرەکەی گەورەتر بوو.

## کتێب گۆڕینەوە

* وا بزانم ئەو سەردەمە کتێب کەم بووە، لە نێوان تۆ و هاوڕێکانتدا کتێب گۆڕینەوە هەبووە.

- لە شارەکەی ئێمەدا کتێب کەم بوو، ئێمە سەفەرمان دەکرد بۆ شارەکانی تر بۆ کڕینی کتێب.

* منیش مەبەستم ئەوییە، وا بزانم تۆ و کاک فەرهاد شاکەلی زیاتر کتێب گۆڕینەوەتان هەبووە.

- ئێمە سێ برادەر بووین لە کفرییا (من و فەرهاد شاکەلی و ئەحمەد شاکەلی) ئەو سێیانە زۆر هۆگری خوێندنەوە و نووسین بووین و ئەو سێیانە بووین کە پرۆژەی گرووپی (کەرکووک - کفری)مان دانا و دروستمان کرد، من لە هەموویان زیاتر سەفەرم دەکرد، ئەویش هۆکاری هەبوو.

* هۆکارەکەی چی بوو؟

- من سەفەری کەرکووکم دەکرد، لەبەرئەوەی ماڵی خوشک و ماڵی دوو مامم و ماڵی هەشت نۆ ئامۆزام لە کەرکووک بوو، کە دەچووم بۆ کەرکووک لەگەڵ کوڕە ئامۆزاکانمدا دەچووم، کتێبخانەکان دەگەڕام و کتێبم دەکڕی، زیاتر کتێبی عەرەبیم دەکڕی، جار بەجاریش یەک دوو کتێبی کوردیم دەکڕی.

* بەتەنیا سەفەرت دەکرد؟

- زۆرجار لەگەڵ کوڕەکانی مامما سەفەرم دەکرد، زۆرجار لەگەڵ باوکما، زۆرجار لەگەڵ ئامۆزایەکما کە دەهات بۆ ماڵمان، کاتێک دەگەڕایەوە منیش لەگەڵی دەچووم، بەینی کفری و کەرکووک زۆر نێزیک بوو، ئەوسا پاسی بەردەوام هەبوو، یەعنی بەیانیان پاسەکان دەکەوتنە رێ و ئێوارانیش ئەگەر بتویستایە لەگەڵیان دەگەڕایتەوە، ئەمە یەک، دووەم، دەهاتم بۆ سلێمانی،

کتێبی کوردیم دەکڕی، ماڵی مامم لە سلێمانی بوو، هەروەها ماڵی چوار پێنج ئامۆزای باوکیشم هەر لە سلێمانی بوون، کۆمەڵێ کەسوکاری زۆریشمان لە سلێمانی بوو، زۆرجاریش دەچووین بۆ بەغدا ماڵی زۆر دەرویشمان لە بەغدا هەبوو، ئەوسا شێخ و دەرویشی هەبوو، ئێمە کە ماڵە شێخ بووین، دەرویشیشمان لە بەغدا هەبوو، راستی بۆ کتێب کڕین لەگەڵ باوکما دەچووم بۆ بەغدا، ئیتر لەگەڵ منداڵی ئەو ماڵە دەرویش و ناسراوانە دەچووم لە هەندێ کتێبخانەی بەغدا کتێبم دەکڕی، ئەوەشم بیر نەچێ هەر لە کفری گەلێ جار لەگەڵ هاورێی بەڕێزم کاک عەلی عەبدولا، کتێبمان لە یەکتر وەردەگرت، هەروەها لەگەڵ باوکمدا بۆ زیارەت و کتێب کڕین بۆ کەربەلا و نەجەفی پیرۆز دەچووین.

* ئەوە باسی سەفەرت کرد بە پاس، باسی ئەو پاسەم بۆ بکە کە تۆ و فەرهاد شاکەلی کتێبتان پیا دەنارد بۆ یەکتری.

– بەڕاستی من کاتێ ئەو کتێبانەم دەکڕی، هەر منیش کتێبم نەدەکڕی، کاک فەرهاد و کاک ئەحمەد شاکەلییش کتێبیان دەکڕی، یان کتێبیان بۆ دەهات، وەک لە بیرم بێ، کاک ئەحمەد شاکەلی کۆمەڵێ برادەری هەبوو لە خانەقین، یان خزمی بوون، یان برادەری بوون، لەوێوە کتێبی باشی بۆ دەهات.

* ئێوەش ئەو کتێبانەتان لە نێوان خۆتاندا ئاڵوگۆڕ دەکرد بۆ ئەوەی ئاگەداری هەموو شتێک بن؟

– بەلام سەیر ئەوە بوو نازانم چۆن پێیان زانی، من کتێبە باشەکانم نەدەدا بە ئەوان بیخوێننەوە، ئێستاش نامەیەکی ئەحمەد شاکەلیم لاماوە، رۆژێ لە رۆژان بلاوی دەکەمەوە، بە عەرەبی بۆی نووسیوم، باسی ئەوە دەکات کە ئاخۆ هەر سوورم لەسەر شاردنەوەی کتێبە باشەکانم.

* ئەو کاتە نامەنووسینتان بە عەرەبی بووە و بە عەرەبییش وەڵامی یەکترتان داوەتەوە؟

– لە سەدا نەوەدی نامەکانمان بە عەرەبی بوو، دەتوانم بڵێم پەنجا نامەی ئەو کاتەی خۆم و فەرهاد شاکەلی و ئەحمەد شاکەلیم ماوە، زۆربەی نامەکان عەربین.

* باشە بۆ بە عەرەبی خۆ کوردیتان زانیوە و بۆ بە کوردی...

– لە نامەدا حەزمان دەکرد بۆ یەکتری بسەلمێنین کە ئێمە سیبەوەیهین لە عەرەبیدا و ئێمە یەک لە یەک شارەزاترین، ئەگەر کەسانێکیش نامەکانمان ببینن بزانن کە ئێمە عەرەبی دەزانین، زیاتر خۆ دەرخستنێک بوو بەڕاستی.

* وا بزانم باسی پاسەکەت تەواو نەکرد.

– جا من مەبەستم ئەوەیە ئەحمەد شاکەلی لەو نامەیەدا کە درەنگ بۆی ناردووم، پاش شەش حەوت ساڵ، دەڵێ ئاخۆ تاکو ئێستاش وەکو ساڵانی قوتابێتی کتێبە چاکەکان دەشاریتەوە و نایدەیت بە کەس بیخوێنێتەوە؟ لە بیرم نەچێت دەبێ بۆ مێژوو بیڵێم زۆرجار کە هاوین دادەهات، ئەنوەر شاکەلی لەگەڵ ئەحمەد شاکەلیدا، ئەگەڕانەوە بۆ دێیەکەی خۆیان، ئەوان لە دێ بوون، من لە شاری کفری بووم، کاک ئەحمەد لە دێی (دێ بنە) بوو، کاک ئەنوەریش، واتە فەرهاد شاکەلی،ماڵیان لە شاکەل بوو، بە پاسەکەی حاجی حەسەندا نامە و کتێبمان بۆ یەکتری دەنارد، پاسێکی گەوزە بوو، پاسە دارینەکان بوو، لە نێوان شارە گەورەکاندا هەبوو، ئەگەر خۆی پەنجا کەسی بگرتایە، سەد کەس سەردەکەوت.

* لەوانەیە هی کەمی سەیارە بووبێت، بۆیە خەڵکێکی زۆر سەرکەوتووە.

– هەر ئەو ئۆتۆمۆبێلە بوو، لە کفرییەوە دەڕۆشت بە ناو کەلار و شاکەل و سەیدە و کوڵەجۆدا و هەموو دێهاتەکانی ئەو ناوچەیە ناچاربوون سواری ئەو سەیارەیە دەبوون، حاجی حەسەن، بە رەحمەت بێ تا ئەم ساڵانەی دوایش مابوو، زۆر یارمەتیی ئەو کەسانەشی دەدا کە دەستکورت بوون، جگە لەوەش یارمەتیدەرێکی باشی، ئێمە بوو، چونکە کتێب و نامەکانی ئێمەی دەهێنا و دەیبرد، بەبێ بەرامبەریش، کەسێکیش بوو پێوەندیی بە خوێندنەوە و رۆشنبیرییەوە نەبوو، نامەکانی دەشاردەوە وای دەزانی قاچاخە و نهێنیی یەکەتیی قوتابییانی تێدایە.

* بۆچی دەترسا لەوەی کە لەوانەیە ئەو نامانە نهێنی تیا بێت، بۆ ئێوە هیچ پێوەندیتان بە حزبەوە هەبوو؟

– بێگومان هەموو قوتابییەک لەو سەردەمەدا پێوەندیی بە یەکەتیی قوتابییانەوە هەبوو، مەگەر خۆی بەکورد نەزانیبێت، ئەگینا باوەڕ ناکەم قوتابییەکی کورد هەبووبێ، پێوەندیی بە یەکەتیی قوتابییانەوە نەبووبێت.

## کۆواری شەپۆلەکان

* هەر لە کفری کۆواری (شەپۆلەکان)تان دەرکرد، ئەو کۆوارە بیرۆکەی کێ بوو؟ چەند ژمارەی لێ دەرچوو؟ ناوەڕۆکەکەی چی بوو؟ ئەگەر بە درێژی باسی بکەیت؟

– ئەو کۆوارە بە دەستنووس دەرمان کرد، دوو ژمارەی لێ دەرچوو، ژمارەی یەکەمی سێ نوسخەبوو.

* هەر سێ نوسخەکەی بە دەستنووس نووسرابوو؟

– هەر سێ نوسخەکەی بە دەستنووس نووسرابوو، ئەو کاتە ئیستینساخ و شتی وا نەبوو، گەلێ لەو سێ نوسخەیە، رەنگە دە نوسخەی برادەرێک کە وا

بزانم ئێستا لە هۆڵندا دەژی، یادی بەخێر، سیروانی حاجی ئەمین رەباتی، ئەو نووسییەوە، پێوەندیشی بە گرووپەکەوە نەبوو، بەڵام هەر حەزی دەکرد خزمەت بە زمان و رۆشنبیریی کوردی بکا، هەر لەو کۆوارەدا کەنعان مەتحەت، عەلی عەبدولا، خۆم (لەتیف هەڵمەت)، فەیسەڵ سالار وا بزانم ئێستا پارێزەرە، ئەمانە بابەتیان بڵاو کردەوە، ئەوەش بەگژاچوونێکی ئەو تەتریک و تەعریبە بوو کە لە کفریدا رووبەڕوومان بووبووەوە، دەمانویست بەو کۆوارە بەرپەرچی ئەو چەوساندنەوەیە بدەینەوە.

* ناوەڕۆکەکەی بەس نووسین بوو؟ وتار بوو، شیعر بوو؟ چی بوو؟

– وتار و نووسین بوو، شیعر بوو، لێکۆڵینەوە بوو، نوکتە بوو، کۆوارێکی هەمەڕەنگ بوو، تەنانەت هەندێ پارچە شیعری شاعیرانی کلاسیکی کوردیشمان تێ ئاخنی بوو.

* بیرۆکەی کێ بوو؟

– وەڵلا پێم وابێ بیرۆکەی هەموومان بوو، ناتوانم بڵێم بیرۆکەی فلان کەسمان بوو، بۆیەش ناومان لێ نا شەپۆلەکان کە هەموو جۆرەکانی ئەدەب بگرێتەوە، من لەوەدا وتارێکم نووسی (هونەر بۆ هونەرە، نەوەک بۆ گەل) کە ئەوسا وای بۆ دەچووم، دروشمی بوونگەرایی و عەبەسی و ئەوانە بوو کە ئەدەبی لامەعقوولیان دەنووسی، جا ئێمە کتێبی سارتەر و کامۆ و یۆجین یۆنیسکۆ و ژانژینێ و شانۆنامە و رۆمان و چیرۆکی ئەو نووسەرانەمان دەخوێندەوە، لەگەڵ کۆمەڵێ نووسەری تردا، کە ئەو سەردەمە لە بەردەستدا بوو، کاریگەریی ئەوانەمان لەسەر بوو، بەتایبەتی من کاریگەریی نووسینی بوونگەرایی و ئەدەبی لامەعقوولم لەسەر بوو، هەر لەو روانگەیەوە وتەی ژمارەی یەکەمم بەو شێوەیە نووسی، هونەر بۆ هونەرە نەک بۆ گەل.

* ئێستا نوسخەی ئەو دوو ژمارەیەت لا ماوە؟

– بەداخەوە، چونکە من دوو سێ جار کتێبخانەکەم لەناو چووە، لەبەرئەوە ناتوانم بڵێم، نوسخەی لە فلان شوێن دەست دەکەوێت، تەنانەت لەم چەند ساڵەی رابردوودا کەنعان مەتحەت کە ئێستا لە ئەوروپایە، هاتەوە داوای نوسخەیەکی لێ کردم، وتم چەند نوسخەیەک لای خۆت نەبوو، وتی نوسخەکانی لای منیش ون بوون، بێگومان لای فەرهادیش نەماوە، بەڵام وەکو ئەوەی کە بوونی هەبووبێ، خۆمان لە بیرمانە و ئەو برادەرانەش دەزانن، ئەو کۆوارەمان دەرکردووە.

* تۆ چوویت بۆ بەغدا، دیارە چوونت بۆ بەغدا و تێکەڵبوونت لەگەڵ ئەو هەموو رۆشنبیرە کورد و عەرەب و کۆڕ و سیمینارانەی بەغدا یارمەتیدەر بوو بۆ ئەوەی ببی بەو شاعیرەی کە ئێستا دەڵێن، لەتیف هەڵمەت لە دەرەوەی کوردستانیش زۆر ناسراوی.

– من لە شاری کفری (خوا و شارە بچکۆلەکەمان)م نووسی، کاتێ کە بڵاو بووەوە، بەراستی دەنگێکی گەورەی دایەوە، خەڵک پێشوازی لێ کرد، چ بەشێوەی ئیجابی چ بەشێوەی سلبی، یەعنی هەبوو لایەنگری ئەو شێوازە شیعرە بوون، هەشبوو بەردەبارانیان دەکرد، من هەردووکیم پێ خۆش بوو، هەر ئەو کتێبە کارێکی وای کرد کە من ئیتر ئاواتەخوازی ئەوە بووم، کە سنووری شارێکی بچووک بشکێنم و بچمە شارێکی گەورەوە، زۆرم پێ خۆش بوو کە ئێمە چووین بۆ کەرکووک، کە چووین بۆ کەرکووک، لەوێ ساڵی حەفتا یەکەتی نووسەرانی کورد دامەزرا، من هەر لە ساڵی حەفتاوە بووم بە ئەندامی یەکەتی نووسەران، یەکەتی نووسەرانی کەرکووک لە ماوەی چوار ساڵی راوێژی نێوان سەرکردایەتی شۆڕش و حکوومەتی عێراقدا هەلێک بوو، ئێمە توانیمان لە کەرکووکدا دەیان چالاکی گەورە و دەیان ڤیستیڤاڵی شیعر و کۆبوونەوەی رۆشنبیری ساز بکەین، توانیمان لە کەرکووکدا بیسەلمێنین کە شیعری کوردی و رۆشنبیریی کوردی لە کەرکووکدا، جێ دەست و جێ پێی خۆی هەیە و دەنگێکی تایبەتییە لە ئاستی هەموو دەنگەکانی تری

کوردستاندا، هەر بەڕاستی جموجۆڵێکی نوێی شیعری لە پێش (خوا و شارە بچکۆلەکەم)ەوە کە لە کفری دەستی پێ کرد لە کەرکووک نەبوو، لە کفرییەوە گوێزرایەوە بۆ کەرکووک، من سوورم لەسەر ئەوەی یەکەم بەردی بناخەی نوێگەری لە شیعری کوردیدا لە کفرییەوە دەستی پێ کرد و دوایی هەموو کەرکووکی گرتەوە و ئینجا چوو بۆ شارەکانی تر.

## ئەمنی کەرکووک

* باسی ئەوەت کرد زۆر کەس لەگەڵ ئەو دەنگە نوێیەی شیعری کوردی نەبوون، وا بزانم لەسەر ئەوەش جارێک لە ئەمنی کەرکووک گیراوی و سەیدا ساڵح یووسفی بەری داویت.

- من لە میهرەجانی یەکەمی شیعری کوردیدا کە لە کەرکووک ساز کرا، ویستم شیعر بخوێنمەوە، منیش و عەبدوسەلام محەمەد کە ئێستا لە سوێد دەژی، نەیانهێشت شیعر بخوێنینەوە، من لە هۆڵەکەدا ئاژاوەیەکم نایەوە و بڕیارم دا شیعر بخوێنمەوە، ئەوانیش، ئەوانەی فیستیڤاڵەکەیان ساز کردبوو، زۆر رقیان لە شیعری نوێ بوو، دەیانوت لێی تێ ناگەین، ئەمە شیعر نییە، کێش و سەروای نییە، ئاڵۆزە، خەڵک لێی تێ ناگا، بێگومان هەموو شتێکی نوێ دوژمنی هەیە، شیعری نوێ لەو سەردەمەدا زیاتر لەبەر گرێچنی و لەبەرئەوەی کە کێش و سەروای نەبوو، بەتایبەتی شیعرەکانی من، یەکەم کەس بووم کە شەرعییەت و ڕەواکاریم دا بە شیعری بێ کێش و سەروا، پێش من هیچ کەسێک بەو شێوە زۆرە، شیعری بێ کێش و سەروای نەنووسیوە و لە دیوانێکدا بڵاوی نەکردووەتەوە، رەنگە یەکێ لێرە و لەوێ شیعرێ دووانی نووسیبێ، بەڵام وەکو ئەوەی بێت کۆمەڵێ شیعر بنووسێ، بەبێ کێش و سەروا و بە دیوانێک بڵاوی بکاتەوە، کەس پێش من ئەو جورئەتەی نەبووە.

* واتە ئەوە شتێکی کتوپڕ بووە و لە ناکاو ئەو شیعرە نوێیانەت کەوتووەتە ناوەوە، بۆیە بەو شێوەیە بەرپەرچ دراوەتەوە؟

- بەڵێ ناوونیشانەکانیشم سەرنجراکێش بوون، (خوا و شارە بچکۆلەکەم)ان، گەڵای خوێ دەوەرێ، مردن لە خوێی شەوایە، لە باوەڵێکی کلیل ونبوودا، ئەمانە جۆرە ناوونیشانگەلێک بوون کە خوێنەری کورد پێی رانەهاتبوو، لەبەرئەوە دەمویست شیعر بخوێنمەوە، نەیاندەهێشت بەتایبەتی لەو میهرەجانەدا بەفێڵ دەریان کردمە دەرەوە و دواتریش ئاگەداری پۆلیسیان کردبوو کە من کەسێکی خۆشەویست نیم، بۆ فستیڤاڵەکە ناشێم، بۆ ئەوەی لە فیستیڤاڵەکەدا بمێنمەوە و ئاژاوە ئەنێمەوە.

* هەر لەبەرئەوەش بوو کە گیرایت؟

- بەڵێ، لەبەرئەوە بوو کە شیعری نوێ دەنووسم، لەبەر سیاسەت نەبوو، تەنیا لەبەرئەوە پۆلیسیان لێ هان دام کە شیعری نوێ دەنووسم، دوای ئەوە کە گیرام و برام بۆ ئەمنی کەرکووک، دواتر کاک سەلام محەمەدیشیان هێنا؛ چونکە ئەویش شاعیرێکی نوێخواز بوو و پشتگیریی لێ دەکردم، ئێمە هەموو هۆڵەکەمان ورووژاند، باوەڕت هەبێ بە سەدان کەس هەستابوونە سەر پێ و چەپڵەیان لێ دەدا، دەیانوت هەڵمەت، هەڵمەت، یەعنی هەڵمەت بخوێنێتەوە، هۆڵەکە شڵەژا، لەبەرئەوە کارێکی وایان کرد کە پۆلیس دوورم بخاتەوە، هەتا میهرەجانەکە تەواو دەبێت من لەوێ نەبم.

## چوون بۆ بەغدا

* هۆکاری چوونت بۆ بەغدا تەنیا لەبەرئەوە بوو کە زیاتر برەو بە شیعر و نووسین و فیکرت بدەیت؟ چونکە بێگومان ئەو کاتە بەغدا شوێنێکی گەورەی سەقافی بوو، هەم شاعیر و نووسەرە عەرەبەکان هەم کوردەکانیش لەوێ بوون.

- بەڕاستی بەغدا چ ئەوسا و چ ئێستاش پایتەختی رۆشنبیری بووە، هەموو داوودەزگا رۆشنبیرییەکانی کورد و عەرەبیش لە بەغدا بوون، هەر بۆ نموونە

ڕۆژنامەی هاوکاری، کۆڕی زانیاریی کورد، کۆواری بەیان، هەندێک جار کۆواری تووتن دەردەچوو، کۆواری زانیاری هەبوو، چواردە ژمارەی دەرچوو، باسی ئەو سەردەمە دەکەم، کۆمەڵێ کۆواری تریش و چاپخانەش لە بەغدا زۆر زۆر بوو، ئێستا لە هەموو کۆلان و سەری کۆلانێکدا چاپخانەیەک هەیە و ئۆفیسێتێک هەیە و کۆمپیوتەر هەیە، ئەو کات لە سلێمانی تەنیا چاپخانەی کامەرانی و یەک دوو چاپخانەی تر هەبوو، لە کەرکووک تەنیا چاپخانەی شەماڵ و کۆماری و شارەوانی هەبوو، بەم شێوەیەی ئێستا نەبوو، کە ئەوانیش هیلاک بووبوون، خوا و شارە بچکۆلەکەمانم لە چاپخانەی شەماڵ چاپ کرد، من ناچار بووم بچم بۆ بەغدا، لە کەرکووک داوودەزگایەکی ڕۆشنبیری نەبوو، تیایدا دامەزرێم، چووم لە بەغدا لە دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردی دامەزرام، یەکەتیی نووسەران هەبوو لە بەغدا، کاک د. عزەدین مستەفا ڕەسووڵ سەرۆکی بوو، کۆڕی زانیاری کورد هەبوو لە بەغدا هاتوچۆمان دەکرد، کۆمەڵەی ڕووناکبیریی کوردی هەبوو، د. مارف و جەمال خەزنەدار و د. عزەدینیش هەر ئەندامی دەستەی باڵا بوون و بەڕێوەیان دەبرد، لەوێ زۆرجار شاعیرانی کورد کۆڕیان ساز دەکرد، من بیرمە، زۆرجار هێمن موکریانی لە کۆڕەکانی کۆمەڵەی ڕووناکبیری کورددا لە بەغدا بەشداریی دەکرد، بە سەدان و دەتوانم بڵێم بە هەزاران خوێندکاری کورد لە زانکۆ و پەیمانگەکانی بەغداوە دەهاتن بۆ بەشداریکردن لەو کۆڕانەدا.

* ئەو کاتە کە تۆ چوویتە بەغدا تا ڕادەیەک ناسراو بوویت، وەکو سەردەمی کفریت نەبوو.

- بەڵێ لە ڕێگەی دیوانی، خوا و شارە بچکۆلەکەمانەوە، بەتەواوی ناسرا بووم و لە چایخانەی پەرلەمانیشا، زۆربەی نووسەرانی کورد ئەگەر بە میوانیش بچوونایە لەوێ دادەنیشتن، پەرلەمان چایخانەیە بوو لە شەقامی ڕەشید، منیش لەوێ زۆر دادەنیشتم.

* یەعنی وەکو چایخانەی شەعبی سلێمانی.

– وەکو شەعبی ئێرە، بەڵام لەوێ کورد و عەرەب و تورکمانیشی لێ دادەنیشت، گۆشەی نووسەرە کوردەکان جیا بوو، زۆربەی نووسەرە کوردەکان دەهاتن، دەتوانم ناویان بهێنم بۆ نموونە کاک حوسێن عارف، کاک بورهان قانع، ئەحمەد تاقانە، رەئووف حەسەن، مارف ناسراو، حەمید عەزیز، کەمال میراودەلی، خالید جووتیار، مەحموود زامدار، جەلالی میرزا کەریم، حەمید خالید، دڵشاد مەریوانی، ئەنوەر قادر جاف، رەفیق سابیر و دەیانی تر، جگە لەوەش مامۆستا کاکەی فەلاح، د. عزەدین مستەفا رەسووڵ، مامۆستا موحەڕەم محەمەد ئەمین، کاک محەمەدی مەلا عەبدولکەریم، د. ئیحسان فوئاد و د. مارف خەزنەدار، ئەمانە هەموو لە بەغدا بوون.

* هەر لەوێش سەرەتا ئەوانت ناسی؟

– لە دەزگای هاوکاری بوون، سەردەمێ مامۆستا موحەڕەم سەرنووسەری کۆواری بەیان بوو، سەردەمێ مامۆستا کاکەی فەلاح سەرنووسەر یان سکرتێری رۆژنامەی هاوکاری بوو، ئێمەش لەوێ لەگەڵیاندا ئیشمان دەکرد، کۆمەڵێ لاو بووین لەو کۆوار و رۆژنامانەدا کارمان دەکرد، یەکەتیی نووسەران و کۆمەڵەی رووناکبیریی بەغدا هەفتانە کۆڕی شیعریان ساز دەکرد و لە کۆوارەکەشیاندا، کۆواری، رۆژی کوردستان، کە بە عەربی و کوردی دەردەچوو، هەروەها یەکەتیی نووسەرانیش، کۆواری یەکەتیی نووسەرانی کوردی دەردەکرد، گەلێ شیعر و لێکۆڵینەوە و بابەتی جوانی بڵاو دەکردەوە.

بەڕاستی ئەوانە دەرگەیەک بوون بۆ ئەوەی ئێمە بابەتەکانی خۆمانی تێدا بڵاو بکەینەوە، من زۆر شانازی بەوەوە دەکەم، کە کۆواری، رۆژی کوردستان دەرگەی بۆ خستبوومە سەر پشت کە کۆمەڵێ لە شیعرە بەرگرییەکانم لەوێ، بڵاو بکەمەوە، یەکەم بڕە شیعری بەرگریم کە زۆربەی سەرچاوەکان، ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە یەکەم بڕە شیعری بەرگریشە لە کوردیدا بڵاو بوویێتەوە، لەو

سالانەدا واتە دوای پیلانی جەزائیری ساڵی ١٩٧٥، لە رۆژی کوردستاندا بلاوم کردەوە، بەناوی (بۆ ئەو شارەی خۆشم ئەوێ و خۆشم ئەوێ).

* ئەی کۆوارەکانی تر؟

- کۆوارەکانی تر کۆواری کۆڕی زانیاری و رۆشنبیری نوێ و هاوکاری و بەیان و شوێنەکانی تر، لەبەرئەوەی لە بارودۆخێکی تایبەتیدا بوون، دەیانویست خزمەتی گشتیی رۆشنبیری کوردی بکەن، بەدەگمەن خۆیان دەدا لەو جۆرە بابەتانە، بابەتی شیعری بەرگری، من بەختەوەرم کە کۆواری رۆژی کوردستان ئەو دەستپێشخەرییەی لە بواری شیعری بەرگریدا بۆ تۆمار کردم، ئێستاش ئەو ژمارەیەم ماوە، بێگومان بڕی دووەمی شیعری بەرگری هەر هی منە، ئەو ژمارەیەشم هەر لا ماوە.

* عوسمان فایەقی بەڕێوەبەری ئەوسای دەزگای چاپ و بلاوکردنەوە بۆ راپۆرتی لەسەر نووسیویت و داویەتی بە ڕێژیم لەسەر ئەو شیعرەت بە ناوی (بۆ ئەو شارەی خۆشم ئەوێ و خۆشم ئەوێ)؟

- لە دوای راپەڕین هاوڕێی بەڕێزم د. فوئاد حەمە خورشید، کە ئێستا بەڕێوەبەری دەزگای بەڕێوەبەرایەتیی رۆشنبیریی کوردییە لە بەغدا، دوای رووخانی ڕێژیم، بەڵگە و نهێنییەکانی ئەو دەزگایە دەست خەڵکی کەوت، راپۆرتێک لەو راپۆرتانەی کە عوسمان فایق، دژی منی نووسیوە، ئەوسا ئەو بەڕێوەبەری دەزگاکە بووە، نووسیویەتی لە شیعری (بۆ ئەو شارەی خۆشم ئەوێ و خۆشم ئەوێ)دا، ئەم شاعیرە (لەتیف هەڵمەت) داوای جیابوونەوەی کوردستان دەکات، د. فوئاد ئەو راپۆرتەی بە دوو نوسخە بۆ ناردووم و ئێستاش لەلام ماوە، ئەو راپۆرتە وا دراوەتە ئەمنی بەغدا کە بگیرێم، بەو تۆمەتەی داوای جیابوونەوەی کوردستانم کردووە لە عێراق، بە بێگومانیش لە سەدا سەد لەو شیعرەدا داوای جیابوونەوەی کوردستان دەکەم لە عێراق.

* عوسمان فایق بەڕێوەبەری ئەو دەزگایە بووە و لەسەر ئەو شیعرەش ئەو بۆچوونەی هەبووە و راپۆرتی لەسەر نووسیوی، چۆن هێشتوویەتی بڵاو ببێتەوە؟

- دوایی دەری کردم، دەری کردم و ئەو بڕیاری دەرکردنەم لایە، تەنانەت نەمویرا بڕۆمەوە دەزگاکەی، بەڵام لە ڕێگەی هەندێ برای رۆشنبیری دڵسۆزەوە، یەکێک لەوانە هاوڕێی بەڕێزم کاک عەباس بەدری، کە من پێشتر لە لاپەڕەکەی ئەوا لە رۆژنامەی عێراقدا بابەتی رۆشنبیریم بڵاو دەکردەوە، لەبارەی ئەدەبی کوردی بە زمانی عەرەبی، کە بە حاڵەتەکەمی زانی لە هاوکاری دەرکراوم، پێی وتم تازە با ئەو خزمەتەی ئەوێت بسووتێ، وەرە من لە رۆژنامەی عێراق بە موحەریر دات دەنێم و دەتکەین بە ئەندامی سەندیکای رۆژنامەنووسانیش، پێم خۆش بوو لە رۆژنامەی عێراق دامەزرام و پاش شەش مانگ ناسنامەی سەندیکای رۆژنامەنووسانم وەرگرت و بووم بە ئەندامی سەندیکای رۆژنامەنووسانی عێراق، سەرنووسەری رۆژنامەی عێراق رۆشنبیر و کەسایەتییەکی بە ئەمەکی کورد بوو بەڕاستی هەوڵی دەدا رووی راستەقینەی وشەی کوردی لەو رۆژنامەیەدا بڵاو ببێتەوە کە مامۆستا ساڵح حەیدەری بوو، یادی بەخێر کۆچی دوایی کردووە.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ رۆژنامەی عێراق لە سەردەمی ئەودا لاپەڕەی (الثقافة الكردية) کە هەفتانە دەردەچوو لاپەڕەگەلێکی زێڕین بوون، زۆربەی برایانی رۆشنبیری عەرەبی عێراق دەیانخوێندەوە و زۆرجار لێکۆڵینەوەی جوانیان لەسەر ئەو شیعرانە دەنووسی کە لەو لاپەڕەیەدا دەکران بە عەرەبی و بڵاو دەبوونەوە.

* لە چایخانەی پەرلەمان، شاعیرە عەرەبەکانت ناسی، وەکو بینین و دانیشتن پێکەوە؟

- وەکو دانیشتن کەمتر، چونکە گۆشەکەمان جیا کردبووەوە، بەڵام لە دوورەوە

دەمـزانی ئەوە فـازیل عـەزاوییـە، ئەوە فـەوزی کـەریمە، ئەوە خـالیـد عـەلی مستـەفـایە، ئەوە مووسـا کریدییـە، کـاتێک کە ئێمـە دەچووینە ژوورەوە، یان ئەوان دەهاتنە ژوورەوە، سـەلاممـان لە یەکـتـر دەکـرد، ناتوانم بڵـێم لەگـەڵیـان دانیشتووم، هەبوو لەگەڵیاندا دانیشتبوو.

## کۆڕ و سیمینار

* ئەی لەو کۆڕ و سیمینیار و فیستیڤاڵە رۆشنبیرییانەی بەغدا دانیشتنت لەگەڵیاندا نەبووە؟

- با شـتـێکت پێ بڵـێم، نەمـدەخـواردەوە و نـاخـۆمـەوە، لەبەرئەوە دانیـشـتـنم نەبـووە لەگـەڵیـاندا، ئەو برادەرانە دانیـشـتـنیـان هەبوو لەگـەڵیـان کـە دەیانـخـواردەوە، چـونکە ئەوان زیاتر شـەوانە لەسـەر مـێزی خـواردنـەوە لە یەکەتیی نووسەرانی عێراق یەکیان دەگرت و لەوێ گفتوگۆی زیاتر دەکرا، لە چایخانەکەدا گۆشەی کوردەکان جیابوو ئەو نووسەر و رۆشنبیرانەشی کە لە شـارەکـانی تری کـوردسـتـانەوە دەهـاتـن، هەر لەوێ یەکـمان دەبینی، بۆ نموونە من دەیان جـار لەگـەڵ فەرید زامـدار، مـحـەمـەد پەژار، سـەعدوڵا پەرۆش، فـازیل شەورۆ، جەوهەر کرمـانج و کاک عەبدوڵا عەباس و کاک جەلالی میرزا کەریم و کـاک حـو سێن عـارف، مـەحـمـود زامـدار، کـاک رەئووف بێگەرد، هـەندێ جـار لەگەڵ شێرکۆ بێکەس، لەگەڵ نەژادی عەزیز سورمێ، خالید جووتیار، ئەحمەد تاقـانە، حـەمـیـد خـالیـد و دەیان نووسـەری تر لەو چایخـانەیە بەیەکـەوە دادەنیشـتین و بابەتمان بـۆ یەک دەخـوێندەوە، لەگـەڵ کـاک مـحـەمـەد مـوکریدا، لەگەڵ کـاک فـەریق ئەمـیندا، لـەگـەڵ سـەلام مـحـەمـەدا، هـەروەهـا لەگـەڵ هـەندێ شـێوەکـاری وەکـو جـەمیل قـەرەنی کـە لەوێ تـابلۆیەکـی خـۆی پێشـکێش کـردم، تابلۆکە دایکێکە منداڵێکی لە بێشکەدایە رای دەژەنێ تا ئێستاش ئەو تابلۆیەم پاراستووە.

## تاراوگە

* بەغدا بۆ تۆ تاراوگە بوو یا نا؟

- وەڵایی بەغدا بۆ هەموومان تاراوگە بوو، بەڵام تاراوگەیەکی ڕۆشنبیری بوو، من نازانم خەڵک چۆن کاتی خۆی بەسەر دەبرد، من بە خوێندنەوە و بە نووسین بەسەرم دەبرد، فەرهاد شاکەلی تا لە بەغدا مابوو دوای ئەویش لەگەڵ کۆمەڵێ برادەری تردا دەچووین بۆ کتێبخانەکانی ساحەی تەحریر و ساحەی ئەندەلوس و هەروەها کتێبخانەی فەڵەستینیە، کە کتێبخانەیەکی گەورە بوو، کتێبمان دەکڕی، کەم کتێبی باش هەبوو لەو سەردەمەدا، ئێمە نەیکڕین، زۆرجار نانی نیوەڕۆ، یان ئێوارەمان نەدەخوارد، بۆ ئەوەی پارەکەی بدەین بە کتێبێک.

* هەر لەسەر تاراوگە، لەناو عەرەبدا نموونەی (شعرا و المهجر) هەیە، کاتێک ئەم کۆمەڵە شاعیرە چوونە ئەمەریکا و ئەمەریکای لاتین و ئاشنابوونیان بە ئەدەبێکی باڵاتر، توانییان ئەدەبێکی نوێ و نایاب بخولقێنن، کوردیش چەندان شاعیری لە دەرەوەی وڵاتە، ئاخۆ توانیویانە بەشێوەیەکی وا بەرچاو برەو بە توانای فیکریی خۆیان بدەن و ئەدەبێکی وا پێشکێش بە کورد بکەن، بیانچوێنین بە (شعرا و المهجر)ی عەرەب؟

- باشترین کتێبی عەرەبی کە برایانی ڕۆشنبیری عەرەب، نووسەرە گەورەکانی عەرەب کە لە تاراوگە، لە ئەمەریکا نووسیویانە، کتێبی (النبي) جبران خەلیل جبرانە کە ئێستاش بە دەیان ملیۆن نوسخەی دەڕوات و لە هەندێ نووسیندا، خوێندوومەتەوە کە خوێنەری کتێبی (النبی) جبران خەلیل جبران لە خوێنەری تەورات و ئینجیل زیاترە لە ئەورووپادا، ئەمە دیاردەیەکی گرینگە.

برادەرانی تاراوگەی ئێمە تا ئێستا کتێبی وایان نەنووسیوە و ئەگەر بەم

هەناسە لاساییکارییەوە بینووسن کە ئێستا لاسایی ئەوروپا دەکەنەوە ناتوانن داهێنانی لەو جۆرە بکەن، کاتێک، جبران خلیل جبران (النبي)ی نووسی، کولتووری رۆهەلاتی برد بۆ ئەوان و بە ئەورووپای ناساند و گیانێکی نوێی کرد بە بەرا، لە کولتووری رۆئاوادا ئیشی نەکرد، چونکە کولتووری رۆئاوا کولتوورێکی ئاشنابوو بە رۆئاواییەکان، گەورەیی جبران لەوەدایە، روحی ئیشراقاتی سۆفیگەریی رۆهەلاتی برد بۆ رۆئاوا، تەنانەت لە تابلۆ شێوەکارییەکانیشیدا، لە یەکێ لە کتێبەکانیدا، تابلۆیەکی هەیە، سێ چین هەن سەیری هەتاو دەکەن، یەکێکیان سەیری دەکات و دەستی خستووەتە سەرچاوی، ئەوە قەت ناتوانێ بگاتە ئەو روحە ئیشراقاتەی کە لە رۆهەلاتدا بە سۆفیگەری ناوی دەبەن، یەکێکی تریان دەستی نەخستووەتە سەرچاوی و چاوی نووقاندووە، ئەوەش دەترسێ لەو روحە شۆڕشگێرییە سۆفیگەرییانە، بەلام یەکێکیان راست سەیری دەکات، ئەوە ئەو سۆفیگەرە یاخیبووەیە کە دەتوانێ جیهانی کۆن وێران بکا و جیهانێکی نوێ دروست بکا، من ئەمە لە ئەدەبی تاراوگەی کوردیدا، بەدی ناکەم، بەداخەوە نووسەرانی ئێمە، ئەگەر باسی سۆفیگەرێتیش بکەن، زۆر بە ئاوەژوو باسی دەکەن و نەهاتوون بنەماکانی سۆفیگەرێتیی رۆهەلاتی بخوێننەوە، جێی داخە لەسەدا نەوەدی لاوانی کورد رۆشنبیریی ئاینییان نییە، هی هیچ ئاینێک، بەلام نووسەرانی ئەورووپای رۆئاوا و رۆهەلات ئاگەداری کولتووری ئاینەکانن و هەر بۆ نموونە رێلکە و گۆتە و لیرمنتۆف و پۆشکین و تۆلستۆی سەرباری شارەزایی لە ئاینی مەسیحی، تەواو شارەزای ئاینی ئیسلام بوون و بەهرەی نووسینیان لە کولتووری ئیسلامییەوە هەلدەهێنجا، بەلام زۆربەی نووسەرانی ئێمە رەنگە تازە ئێستا دەستیان کردبێ بەخوێندنەوەی هەندێ کتێبی سۆفیگەرێتی، لەبەرئەوە، من نالێم هەمووی، بەلام زۆربەی نووسەرانی تاراوگەی کورد، لاسایی بارودۆخی رۆئاوا دەکەنەوە، رۆئاواش ئەو جۆرە دەقەی بەدل نییە، نموونەیەک دەهێنمەوە ئێستا لە تاراوگەدا نووسەرێکی کوردی خەلکی تورکیایە، رۆمانێکی بە یۆنانی نووسیوە، سێ وەزیری یۆنانی ئەو رۆمانەیان

خوێندووەتەوە، وەزیری ناوەخۆ، وەزیری داد، وەزیری راگەیاندن، ئەو رۆمانەیان خوێندووەتەوە و بۆچوونی خۆیانیان لەسەری دەربڕیوە، بە یەکێ لە رۆمانە دەگمەنەکانی ناو دەبەن، وەزیری راگەیاندن وتوویەتی ئەم رۆمانە، رۆمانە یۆنانییە کلاسیکییە مەزنەکانم بیر دەخاتەوە، من باسی ئەمە ناکەم، ئەم نووسەرە هاتووە باسی کولتووری کوردەواری دەکات، ئایا لێرە وەزیری کورد کتێب هەر دەکڕێ، تا بیخوێنێتەوە؟

* دەتوانی خۆت وەڵامی ئەو پرسیارە بدەیتەوە؟

– وەزیرێک ناناسم لە ئاستێکی وا رۆشنبیریدا بێت، خەمی ئەوەی بێت رۆژ ببێتەوە و بچێتە کتێبخانەیەک و کتێبێ بکڕێ، بە سەدان کەس هەیە کە تەلەفۆنێکی بۆ دەکەن و دەڵێن لە فلان شوێن کتێبێکی وا باش هەیە، ئیتر ئەم خەمی ئەوەیەتی زوو رۆژ ببێتەوە و بچێ ئەو کتێبە بکڕێ، لەلایەکی تریشەوە خەمی ئەوەیەتی تا ئەم دەچێ کتێبەکە نەمابێت، بەڵام من باوەڕ ناکەم کاربەدەست و بەرپرسێکی گەورەی کورد لە ئاستی وەزیریدا، یان لە ئاستی پەرلەماندا، ئەو خەمەی هەبێت کە ئایا تا رۆژ دەبێتەوە ئەو کتێبە ماوە بیکڕێ، ئەوان هەر کورسییان لە بیرە.

## ١١ی ئادار

* بەیانی ١١ی ئادار، رێگە خۆشکەربوو بۆ ئەوەی، پاش ئەو سستییەی کەوتبووە ناو سەرجەم کایەکانی ئەدەبی و رۆشنبیریی کوردی، هەوڵی بووژاندنەوەی بدرێت؟

– باوەڕت هەبێت، ئێمە وەکو گرووپی کەرکووک – کفری پێش بەیانی ١١ی ئادار و لە ناوەندی حەفتاکانەوە دەستمان پێ کردووە، بەڵام بەیانی ١١ی ئادار رەهاییەکی هێنایە کایەوە کە ئێمە بتوانین بەئاسانی بابەتەکانمان بڵاو بکەینەوە، رێگە خۆشکەر بوو بۆ بڵاوکردنەوە، نەک بۆ دەستپێکردن، ئەگینا

خۆ دوای بەیاننامەکە هیچ داوودەزگایەکی رۆشنبیریی هاوچەرخ دانەمەزرا.

* مەبەستم بڵاوکردنەوە و دەرچوونی کۆمەڵێ کۆوار و رۆژنامە و گەشەکردنی بوو.

- بەڵێ دەورێکی باڵای هەبوو بۆ ئەوەی ئێمە بەئاسانی سەرچاوە رۆشنبیرییەکانمان دەست بکەوێت و بەئاسانی بابەت و بەرهەمەکانی خۆمان بڵاو بکەینەوە، پێش بەیانی ١١ی ئادار ئێمە نووسینەکانمان بۆ خۆمان دەنووسی و لە بوارێکی تەسکدا بڵاومان دەکردەوە، وەکو بواری ئێستگەی کوردی لە بەغدا، یان ئەگەر بمانتوانیایە جارێ یان دوو جار دەنگی خۆمان بگەیاندایەتە کۆواری رزگاری، بەڵام بەیانی ١١ی ئادار سنوورەکانی بەزاند، بەتایبەتی بۆ (روانگە) فەزایەکی تایبەتی هێنایە کایەوە، بۆ ئەوەی ئەو برادەرانە بیر لە شتی نوێ بکەنەوە، چونکە کاتێ سەرچاوە رۆشنبیرییەکانی نوێ، دوای بەیانی ١١ی ئادار کەوتنە بەردەست، ئینجا برادەرانی (روانگە) بیریان لەوە کردەوە کە گروپێک دامەزرێنن و هەوڵێکی نوێ لە بواری شیعر و ئەدەبی کوردیدا بدەن، بەڵام ئێمە لە کفری پێش بەیانی ١١ی ئادار لە ساڵانی ٦٧ و ٦٨ دا بنەمای ئەو نوێگەرییەمان دامەزراندبوو، بەڵگەشم بۆ ئەمە بڵاوکردنەوەی دوو دەقی منە لە کۆواری (رزگاری)دا و بڵاوکردنەوەی دەیان دەقی من و ئەنوەر شاکەلییە لە هەندێ بەرنامەی کاک جەلالی میرزا کەریم و کاک عەبدوڵا عەباسدا کە لە ئێستگەی کوردی لە بەغداوە پێشکێش دەکرا.

## نوێگەری

* کاتێک گروپێک یان کۆمەڵێ نووسەر و شاعیر هەوڵی نوێبوونەوە دەدەن، ئەو کاتە کەلەپووری نەتەوەیی چی لێ دێت؟ پشتگوێ دەخرێت، یان دەبێ بە هەوێنی نوێبوونەوە، یانیش بەشێوەیەکی نوێ، مامەڵە لەگەڵ ئەدەبەکەی پێشووتر دەکرێ؟

- گرووپی (روانگە) بەیاننامـەیەکی هەیە و ئێمـەش گرووپی (کەرکووک - کفری) بەیاننامەیەکمان هەیە و زۆر سەرگەرمانە بیرمان کردووەتەوە، هەرچی کولتووری کوردی هەیە، ئەوەی پێش خۆمـان نووسـراوە، وەکو بنچکە بالایەک سەیری دەکەین و بەرپەرچی هەمووی دەدەینەوە و خەتێکی راست و چەپمان بەسەر هەموویدا هێناوە، ئەوەشمان لە نوارگەی بیرکردنەوەیەکی لاوانەی شێتگیرانەدا ئەنجام داوە، ئێمـە لەو سەردەمەدا بیرکردنەوەیەکی شێتگیرانەمان هەبوو دژی کولتووری کوردی و زیاتر لەژێر کاریگەریی نوێگەری شیعر و رۆشنبیریی عەرەبیدا بووین، دواتریش لەژێر کاریگەریی شیعری نوێگەریی ئەورووپی، بۆ نموونە ئێمە هەر لە تەمەنی ١٥- ١٦ ساڵیدا دەستمان دابووە خوێندنەوەی بەرهەمەکانی سارتەر، کامۆ، یۆجێن ینیسکۆ، فۆکنەر، هەمنگوای، جەبرا ئیبراهیم جەبرا، غەسان کەنەفانی، بەدر شاکر سەیاب، شەوقی ئەبوشەقرا، محەمەد ماغوت، پۆشکین، نازم حیکمەت کافکا، لەگەڵ دەیان نووسەر و شاعیری تر...

* کەواتە ئەو نوێخوازییەی بانگەشەتان بۆ دەکرد هەڵگەڕانەوە بوو لە کۆن؟

- ئەوساش و ئێستاش لای من نوێخوازی هەڵگەڕانەوەیە لە کۆن، من گاڵتەم بەوە دێت کە هەرچی لە کۆندا نووسرابێت و لە دووتوێی پەڕاوێکدا کۆ کرابێتەوە لە ماڵێکدا لە ناو سندووقە شڕەیەکدا، بەجێ مابێ ئێستا ئێمە حیسابی کولتووری بۆ بکەین، ئێستا بەلای کەمەوە، پێنج هەزار کەس شیعر دەنووسن، ئاخۆ ئەم پێنج هەزار کەسە کە هەندێکیان دەمرن و ئەو شیعرانەی بەجێ دەمێنێ بەدەستنووسی کە شیعرگەلێکی سەقەت و بێ مانان دەکرێ، پاش پێنج سەد ساڵی تر حیسابی کولتووریان بۆ بکەین؟ بێگومان نابێ، زۆربەی ئەو شتانەش کە بە ناوی شیعری فۆلکلۆری و بە ناوی کولتوورییەوە ئێستا ماون و هەندێ لە زانایان کاری لەسەر دەکەن، من حیسابی کاغەزێکی سپیشی بۆ ناکەم، کاغەزە سپییەکەم بەلاوە گرینگترە، چونکە دەتوانم لەسەر

کاغەزە سپییەکە بەرهەمێک تۆمار بکەم، بەڵام ئەو کاغەزانە رەش کراونەتەوە و خەسار کراون، هەموو شتێک بە کولتوور نازانم، شتێک بایەخێکی ئەدەبی و رۆشنبیریی نەبێت کولتوور نییە و بیسووتێنە، چۆن کۆمەڵێ بینا هەیە بینای گڵکاری و کۆن هیچ کارێکی ئەندازیاریی تیا نییە، بیڕووخێنین، باشترە لەوەی بمێنێتەوە، چونکە دیمەنی شارەکە ناشرین دەکات، هەندێ بابەتیش کە بەناوی کولتوورەوە ماوەتەوە بیسووتێنە، نەمێنێ باشترە وەک لەوەی رووی رووناکیی کولتووری کوردی لیخن بکا.

* ئەگەر سەیری مێژووی ئەدەبی کوردی بکەین، دەبینین ئەدەبی کلاسیکی کوردی بەلاساییکردنەوەی کلاسیکی عەرەبی و دواتر لە سالانی سییەکانی سەدەی رابردوو گۆران و شێخ نووری و... هتد بەلاساییکردنەوەی شیعری نوێی تورکی (ئودەبای فەجری ئاتی) ئەدەبی کوردییان نوێ کردەوە و هەروەها ئێوەش (گرووپی کەرکووک - کفری و گرووپی (روانگەش) بە لاساییکردنەوەی شیعری عەرەبی و ئەورووپی هەوڵتان دا، شیعری کوردی تەواو نوێ بکەنەوە و هەموو یاسا و کۆتەکانی بەردەم شیعر بشکێنن، بۆچی هەموو کات لاساییکردنەوە؟

- بێگومان ئەوەی کراوە، ئەوەی گۆران و شێخ نووری و پیرەمێرد و مامەند کەرکووکی و... هتد، کردوویانە شۆڕشێکی رۆشنبیری بووە، ئەوەی لە حەفتاکانیشدا گرووپی کفری و (روانگە) کردوویانە شۆڕشێکی رۆشنبیری بووە، ئێمە ناتوانین بڵێین ئەم شۆڕشانە کاری لاساییی دەقاودەقی شۆڕشە رۆشنبیرییەکانی عەرەبی و ئەورووپایە.

* مەبەستم ئەوە نییە دەقاودەق لاسایی بێت، بەڵام بۆچی هەموو کات لەبەر رۆشناییی ئەدەبی دەرەوە، ئەدەبی کوردی، هەردەم پەیڕەوی رێبازێکی ئەدەبیی کردووە، یان خۆی نوێ کردووەتەوە؟

– خـۆ شـــۆڕشی نەتـەوایەتیش لە هەمـوو دنیـادا هەیە، ناتوانـین بڵـێـین ئەو شۆڕشـانەی کە کـورد دەیکات، لاسـاییکردنەوەی شـۆڕشـەکانی ئەمـەریکای، لاتین و ولاتانی ئـەفریقـیـان، یان ئـەگەر پێـشـمـەرگەیەکی ئازا و قـارەمـانمان هەبێت بڵێین لاسایی جیڤارای کردووەتەوە، ئەمە هەر وایە هەموو نەتەوەیەک، چ لە بواری رۆشنبیری و چ لە بواری نـەتەوایەتیدا، شـۆڕش و شـۆڕشگێڕێتی خـۆی هـەیە، گـۆران و نووری شـێخ سـاڵح کـاریگەر بـوون بە ئودەبای فـەجـری ئاتی، بەتـایبـەتی گـۆران کاریگـەریی جاهـیـد سـدقی و عـەبدولحـەق حـامـیـد و تۆفیق فیکرەتی لەسەر بووە، دەتوانم بڵێم هەندێ جار گۆران لاسایی تـۆفیق فـیکرەتی کـردووەتـەوە ئەوەش لە سـەرەتـاکـانیـدا، نەوەک لـە کـۆتاییـدا، لە سـەرەتـاکـانیـدا گـۆران کـاریگـەریی شـیـعـری ئینگلیـزیشی لەسـەر بـووە وەکـو شیللی و بایرۆن و... هتد، بەتایبـەتی گوڵی لاولاو لەگەڵ وا بزانم (ئـەی بولبول و گیان تۆ چیت)؟ ئەوانە هەمووی کـاریگەریی شـیـعـری ئینگلیـزیی لەسـەرە، جگە لـە هەمـوو قـەسـیـدە رۆمـانـسـییـەکـانی تری کـە کـاریگەریی شـیـعـری رۆمـانسـیی ئـینگلیـزیی لـەسـەر بووە، بـەڵام لە نوێکـردنەوەدا ئەویش و شـێخ نووریش زیاتر کـاریگەری (ئودەبای فـەجـری ئاتی)یان لەسـەرە، بەڵام من وەکو دەق، گۆران بە شـاعیرتر دەزانم و وەکـو تەنزیر و شـتی تیـۆرییش، نووری شێخ سـاڵح دەستپێشخـەرە، لە بواری تیۆر و تـیـۆرکـاریدا نووری شێخ سـاڵح، پێش گۆران باسی نوێکردنەوەی کردووە، بەڵام لە چەسپاندندا بۆ نووسینی شیعری نوێ، گـۆران لە پێشـتـرە، زۆر بەچاو قـایمییـەوە دەیڵـێم، شـیـعـرێکم نییـە لە شیعرێکی مایکۆفسکی یان ئەراگۆن یان یفتۆشنکۆ بچێت، بەڵام وەکو چۆن لە بیناسـازیدا هـەندێ نەخشـە و تـەسـمـیمـی ئەوروپا هـاتووەتە ناو کـوردسـتـانەوە، ئێـمـە هـەندێ لە بیـنـاسـازیی شـیـعـرمـان هێنایە نـاو بیناسـازیـی شـیـعـری کوردییـەوە، بەڵام بەشێـوازێکی کوردانە، ئەگـەر هەموو شیعرەکانی من بکرێن بە عەرەبی، یان ئینگلیزی، کەسێک ناتوانێت بڵێ ئەم شیعرەی لەتیف هەڵمەت لە سـەدا سـەد لـەو شـیـعـرەی عـەبدولـوەهـاب بەیاتی، یان فـازیل عـەزاوی، یان پابلـۆ نیـرۆدا، یان مـایکـۆفـسکی دەچێت، هـەندێ لە ڕەخنـەگـران پێـیـان وایە،

هەموو دەقێ دەقانگیری دەقەکانی پێش خۆیەتی و هیچ دەقێکی تازە نییە، هەر ئەو قسەیەی نیچە دەکەن کە هیچ شتێکی تازە لەژێر ئاسماندا نییە، دەقەکان لە یەکترەوە زاوزێ دەکەن، تەنانەت هەندێ کەس کە لەسەر دەقە پیرۆزە ئاسمانییەکانیان نووسیوە، دەڵێن هەر هەموویان دەقانگیری یەکن، بەڵام هەرکەسە و شێوازی تایبەتیی خۆی هەیە، شەکری کلۆ و کەللەشەکر و شەکری وردە، شێوەکانیان جیاوازن، بەڵام تام یەک تامە ئەویش شیرینە، هەموو دەقەکانیش جیاوازن، بەڵام دەبێ شیرین بن کە شیرین نەبوون، دەق نین و ئەوە ئەو دەقە شیعرییەتی خۆی لە دەست داوە و رەسەن نییە و مۆرکی نەتەوایەتیی پێوە نییە، ئەوە بۆچوونی منە.

## بەیاننامەی گرووپی کەرکووک - کفری

* لە ١٤ی مانگی تەمووزی ١٩٧١دا گرووپی کەرکووک - کفری بەیاننامەیەکتان دەرکردووە، بەڵام لە هیچ کۆوار و رۆژنامەیەکدا بڵاو نەبووەتەوە، بۆچی؟

- ئەو کاتە ئێمە بە سەد نوسخە بەسەر بەشداربووانی گۆنگرەی دووی یەکەتیی نووسەراندا لە هەولێر بڵاومان کردەوە، هەر دوابەدوای بڵاوکردنەوەی ئەو سەد نوسخەیەی بەیاننامەکەشمان، لەوێ شانۆی شیعر خوێندنەوەی هۆڵەکەمان داگیر کرد، چونکە نەیاندەهێشت شیعر بخوێنینەوە، ئەوە یەکەم جارمان بوو، چووینە سەر شانۆکە و شیعری خۆمان خوێندەوە لە هەولێر.

* واتە بانگ نەکران خۆتان رۆشتن؟

- بانگ نەکراین، چونکە وتیان ئێوە ناخوێننەوە، ئێمە لە خانەی خوێنەران دەرکراینە دەرەوە، کە زانیمان وایە من و فەرهاد شاکەلی بازمان دایە سەر شانۆکە و میکرۆفۆنەکەمان داگیر کرد و دەستمان کرد بە شیعر خوێندنەوە، بۆ مێژوو دەیڵێم، جەماوەرمان لەگەڵدا بوو، کردیان بە چەپڵەرێزان، چونکە

شتی وا نەبووبوو. ئێمە شۆڕشێکی شیعریمان بەرپا کرد، بەڵام کۆڕسازانمان تۆقاند.

* کێ بوون؟

- یەکەتیی نووسەران بوون و هەندێ لە نووسەرانی کۆن کە کۆنانە بیریان دەکردەوە؛ چونکە مەحاڵ بوو چاو و زمان و گوێیان بە نوێ راهاتبێ، لەو سەردەمەدا، لەبەرئەوە دژایەتییان کردین و دواتر پۆلیس پێی وتین، ئێستا هەولێر بەجێ نەهێڵن، دەتانگرین، ئەمە ساڵی ١٩٧١ بوو، ئێمە ناچار بووین ئەو رۆژە هەولێر بەجێ بهێڵین. برادەرێکی تریشمان لەگەڵ بوو، بەس ئەو نەیخوێندەوە، پشتگیریی دەکردین، ئەویش کاک یووسف سدیق زەنگنە بوو، کە برادەرێکی خۆشەویستی خۆم بوو، خەڵکی شۆڕیجەی کەرکووک بوو، دیوانێکی شیعری هەبوو بەناوی (چوارینەکانی زەنگەنە) کۆنخوازیش بوو، بەڵام پشتگیریی لێ کردین و لە کودەتای سەر شانۆکەدا هاوکارمان بوو.

* ئەی کۆنخوازبوو، چۆن پشتگیریی لە ئێوە دەکرد؟

- بەڵام لەوێدا زۆر ئازایانە بەرگریی لێ کردین و وتی چیتان بەسەر بێت، من هاوبەشتانم، ئەویش لەگەڵماندا هاتەوە بۆ کەرکووک و ئیستینکاری ئەو هەڵوێستەی کرد، کە ئێمە لەوێ دەرکراین.

* بۆچی تەنیا تۆ و فەرهاد شاکەلی ئەو بەیاننامەیەتان ئیمزا کرد، ئەی بۆچی لەتیف حامید و ئەحمەد شاکەلی ئیمزایان نەکرد؟

- راستی ئەوان نەهاتبوون بۆ هەولێر، ئێمە کۆمەڵێکی نوێخواز بووین، لەناو نوێخوازیشدا، شەرت نییە، هەموو نوێکان وەکو یەک بن، هەر لە نوێخوازانی عەرەب و ئەوروپاشدا هەموویان یەک بۆچوونیان نییە، رەنگە بۆچوونی من و فەرهاد شاکەلی سەرگەرمانەتر بێ، بۆیە سەرگەرمانە ئەو بەیاننامەیەمان لەوێ نووسی و بڵاومان کردەوە.

* واتە تەنیا تۆ و کاک فەرهاد ئەو بەیاننامەیەتان نووسی؟

- بەڵێ تەنیا من و کاک فەرهاد ئەو بەیاننامەیەمان نووسی و من و فەرهاد هەتا ئێستاش بەرپرسین لە ناوەڕۆکی ئەو بەیاننامەیە، دەتوانم بڵێم ئێمە لەو بەیاننامەیەوە جیابووینەوە لەوانی تر.

* سەردێری بەیاننامەکە (شێتەکان، سەرنج، هەڵوێست، پڕۆژە) مەبەستان چی بوو لە وشەکانی سەردێری ئەو بەیاننامەیە؟

- لە زۆربەی کتێبە دەروونییەکان و ئەو کتێبانەی باسی بلیمەتانی ئەدەب و هونەر و رۆشنبیری دەکەن، باسی ئەوە کراوە، ئەوانەی داهێنەرن لە بواری نووسین و شێوەکاری و هەر بوارێکی تردا جۆرە شێتییەکیان تێدایە، ئێمە ژیانی ئەوانەمان زۆر دەخوێندەوە، لەبەرئەوە شێتیمان هەڵبژارد، هەر کارێک بکەین، جۆرێکە لەو شێتییە داهێنەرانەیە کە دەروونناسان باسی دەکەن، سەرنجیشمان لەبارەی ئەدەب و شیعر و کولتووری کوردی، ئەوەیە کە کولتووری کوردی دواکەوتووە و دەبێ تەجاوز بکرێت، هەڵویستیشمان ئەوەیە هەڵوێستێکی نەگۆڕە و سوورین لەسەر ئەو هەڵوێستەمان کە ئەدەبی کوردی دواکەوتووە و دەبێ شۆڕشێکی بەسەرا بکرێ، پڕۆژەش ئەوەیە کە کردمان، دەتوانم بڵێم رەوتی شیعری کوردیمان گۆڕی.

* وەکو خۆشت ئاماژەت پێ دا (گرووپی کفری) پێش (روانگە) هەبووە، بەڵام وەکو گرووپی (روانگە) دەنگ و سەدای نەبوو، هەرچەندە ئێوەش وەکو ئەوان هەوڵی تێپەڕاندنی ئەو دۆخەی ئەدەبی کوردیتان دەدا لەو سەردەمەدا بۆچی؟

- لە راستیدا ئێمە چەپرەوی چەپرەوەکان بووین، لە هەڵوێستی رۆشبیریماندا، خۆمان نەدەدایە پاڵ هیچ حزب و لایەنێک، سەرگەرم و شێتگیر بووین، لە دەرەوەی حزبەوە سەیری هێڵەکانی شیعرمان دەکرد، بەڵام

برادەرانی روانگە ئەگەرچی سەر بەچەند حزبێک بوون، هەیانبوو شیوعی بوو، پارتی بوو، هەیانبوو چەپی پارتی بوو، بەڵام بەجۆرێک لە جۆرەکان یەکیان گرتبوو و لەلایەن ئەو هەموو لایەنەشەوە یارمەتی دەدران، هەر بۆ نموونە رۆژنامەی هاوکاری کە وا دەزانم چەپی پارتی، بەڕێوەی دەبرد، کاک حیلمی عەلی شەریف و سەربەست بامەڕنی و ئەوان. رێگەی برادەرانی روانگەیان دا زیاتر لە ئێمە بابەتەکانیان بڵاو بکەنەوە و زۆرجار لاپەڕەیەکی تەواو بۆ برادەرانی روانگە تەرخان کرابوو، بۆ بەیاننامەکەیان و چاوپێکەوتنیان و لەسەر نووسینیان و گفتوگۆ لەسەر روانگە، بەڵام ئێمە دوور بووین لەوانەوە، ئەگەر لە پێشیشدا لەگەڵیان بووبێتین، بێلایەن بووین لە نووسیندا و لایەنداریمان لە نووسیندا فەرامۆش کردبوو، بەڵام بۆ ئێمە تا شیعرێک بڵاو دەکرایەوە، قیر سپی دەبوو، ئەسڵەن و ببڕای ببڕ رێگەی بەیاننامەکەمانیان نەدا، بەتایبەتی من بەتەواوەتی دوژمنایەتی کرام کاتێک کە برای خۆشەویستم کاک ئەحمەد شاکەلی، چاوپێکەوتنێکی لەگەڵدا کردم کە تێیدا وتم: "روانگە هێلکەیەکی پیس بوو هیچی هەڵنەهێنا"، ئەوە یەکەم قسە بوو بەروانگە بکرێ ئیتر لەوەوە شتی من بەساڵ و بە شەش مانگ قەدەخە دەکرا، لە هاوکاری و بەیاندا، دەیانوت، دوژمنی روانگەیە نەیاندەهێشت شتم بڵاو ببێتەوە، دوژمنایەتیی گرووپی کفری و روانگە ئاشکرا بوو. دوژمنایەتی رۆشنبیری دەڵێم، ئەگینا هەموو پێکەوە دادەنیشتین و قسەمان دەکرد و باسی کۆن و نوێی وێژەی کوردیمان دەکرد.

## ناکۆکیی نێوان گرووپی کفری و روانگە ٧

* خۆ هەردوو لاتان مەبەستتان نوێبوونەوەی شیعری کوردی بوو، بۆچی ئەو ناکۆکییە کەوتە نێوانتان، هەر لەبەر ئەو شتانە بوو؟

– لە هەموو وڵاتێکدا هەر شۆڕشێک کە روو دەدات، جاری وا هەیە لە وڵاتێکدا سێ حزب شۆڕش دەکەن، هەمووشیان مەبەستیان ئازادکردنی ئەو نەتەوە و

ولاتەیە، بۆ نموونە لە سەردەمی مەلەکییەتدا، چەند حزبێک لە عێراقدا، بەنهێنی ئیشیی کردووە بۆ رووخاندنی رژێمی مەلەکییەت و دامەزراندنی رژێمێکی ئازادیخواز لە عێراقدا، ئێمەش بەجیا ئیشمان دەکرد، هەر دوو لاشمان مەبەستمان نوێکردنەوەی شیعر و رۆشنبیریی کوردی بوو، بەلاّم هەر یەکە و بەجۆرێک بیرمان دەکردەوە و هەر یەکە و رێگەیەکمان گرتبوو، کورد دەڵێ: هەموو رێگەکان دەچنەوە بانە، عەربیش دەڵێ: هەموو رێگەکان بۆ رۆما دەڕۆن، مەبەستی هەموومان ئەوە بوو کە دەمانویست بگەینە بابڵێین رۆمای نوێگەری، بانەی نوێگەری، وا بزانم گەیشتیشین، ئێستاش هەر یەکەمان بەجۆرێ گەیشتووینەتە رۆمای نوێگەری و کەسیشمان نەبووین بە تەگەرە بۆ ئەوی ترمان، رەنگە لە هەندێ شتیشدا هەردوو لا تێکەڵ بووبێ و زۆربەی خوێنەران ئەم جیاوازییەش نازانن ئەوەندە دەزانن، دەقێکی نوێیە و نووسراوە و پێیان خۆشە بیخوێننەوە، ئیتر نازانن ئەمە سەر بەگرووپی کفرییە، یان سەر بەگرووپی روانگەیە، یان لە دەرەوەی کفری و روانگەیە، چونکە لە دەرەوەی کفری و روانگەش کەسانی تر هەبوون کە نوێگەرییان دەویست و خۆشیان نوێگەر بوون، یەکێک لەوانە شاعیری نوێخواز، ئەنوەر قادر محەمەد، ئێستا لە زانکۆی سلێمانی دوکتۆرە کە بەجوانترین دیوانی (زریان) بوونی خۆی چەسپاندووە و دوای ئەوە زایەڵەی زەنگ، هەروەها رەفیق سابیر، ئەویش هەر یەکێ بوو لە دەرەوەی روانگە و کفری، ئەوسا لەبەرەی چەپدابوو و دەنگێکی تایبەتی بوو، هەروەها سەلام محەمەد و سەعدوڵا پەرۆش و فەرید زامدار و فازیل شەورۆ و سەلاح شوان و دڵشاد مەریوانی و ئەحمەد تاقانە، هەندێکی تریش هەبوون تا ئێستاش بێلایەنیی خۆیان پاراستووە و شیعر و نووسینی زۆر جوانیان بەخشیوە بە جوگرافیای رۆشنبیریی کوردی و ناوێکن لە ناوە گەورەکان لە ئەتڵەسی رۆشنبیریی کوردیدا.

* کەواتە لەبەرئەوەی ئێوە دەرگاتان بۆ والا نەبوو لە گۆوار و رۆژنامەکاندا بەرهەمەکانتان بلاّو بکەنەوە، بۆیە پەناتان بردە بەر

ئێستگەی کوردیی بەغدا، بۆ بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانتان؟

– من باسی ئێستگەی کوردی لە شەستەکاندا دەکەم، جەمال شارباژێڕی خۆی یەکێک بووە لە گوێگرەکانی شیعری من، ئێستا ماوە و لە لەندەن دەژی، کاتێ لە شەقامی مەولەویدا یەکترمان ناسی، وتی من چەند ساڵێکە تۆ دەناسم لە ٦٧ و ٦٨ ەوە کە شیعرەکانت لە بەرنامەکانی کاک جەلالی میرزا کەریم و عەبدولا عەباسەوە بڵاو دەکردەوە، من لەو ساوە گوێگری ئەو شیعرانەم و دەسخۆشیت لێ دەکەم شتی زۆر تازەی تێدایە، ئێمە لە ناوەندی شەستەکانەوە شتەکانمان بڵاو دەکردەوە......

* کاک عەلی تاهیر بەرزنجی لە نامەی ماستەرەکەیدا، بەناوی (کاریگەریی روانگە لە سەر شیعری نوێی کوردی) لە شوێنێکدا باسی ئەوە دەکات، کاک شێرکۆ وتوویەتی، من و حوسێن عارف چووین بۆ کەرکووک، لەتیف هەڵمەت و لەتیف حامیدمان بینیوە، ئەوان نەهاتوونەتە پێشەوە لەبەر چەند هۆیەک، هۆکانی چی بوو؟ خۆشت وتووتە رێک نەکەوتووین؟

– لەبەرئەوەی ئێمە سەرگەرمتر بووین، لە بەیاننامەکەشماندا خەتێکی راست و چەپمان بە سەر کولتووری کوردیدا هێناوە، بەڵام ئەوان پشتگیریی کولتووری کوردی دەکەن، ئەوە یەکێک بوو لە خاڵە سەرەکییەکانی رێکنەکەوتنمان، دووەم بەڕاستی ئێمە هەموومان بێلایەن بووین، بەڵام دەتوانم بڵێم ئەوان هەموویان سەر بەلایەن بوون، ئەمەش بۆ ئێمە کارێکی دژوار بوو، هیچ کەمی و شوورەیی نییە بۆ شاعیر ئەگەر شیعری موناسەبە بڵێ، برادەرانی روانگە شیعری موناسەبەیان دەوت، شیعریان بە سەرکردە گەورەکانی کورددا دەوت، مافی خۆشیان بوو، بەڵام ئێمە ئامادە نەبووین نە شیعری موناسەبە بڵێین نە شیعر بەسەر گەورەکانی کورددا بڵێین، کاتێ ئەوان کە شیعرێکیان بە سەر سەرکردەیەکی کورددا دەوت، بە هەزاران کورد چەپڵەی بۆ لێ دەدان، بێگومان ئەوانەی کە لەوێ بوون لە روانگەیەکی

سیاسییەوە، ئەوەیان بەدڵ بوو و چەپڵەڕێزانیان بۆ دەکرد، بەڵام کە من دەچوومە کۆڕێکەوە شیعرم دەخوێندەوە و دەموت (ئەم کولەکانە دەشکێنم / ئەمە باوەڕی منە/ ئاگرەکەم ناتوێتەوە/ شینایی ئاسمان وەکو چڵی یادگار لە سەر دڵما دەشکێنم)، دەیانوت قسەی قۆڕ، ئەمە کەی شیعرە، چونکە نەباسی سەرکردەیەکی کورد دەکات و نە لایەنێک و نە کێشی هەیە و نە سەروا.

* ئەی روانگەییەکان بۆچوونیان چی بوو، لەسەر شیعرەکانت؟

– روانگەییەکان جوانترین وتاریان لەسەر دیوانی (خوا و شارە بچکۆلەکەم) نووسی و لە هاوکاریدا بڵاویان کردەوە و وتیان ئێمە نوێگەرییەکمان دەوێ وەکو ئەو شیعرانەی لەم دیوانەدا هەیە، لەو لایەنەوە روانگەییەکان بە ویژدانەوە روانییانە (خوا و شارە بچکۆلەکەم)یان و بەرز هەڵیان سەنگاند، بەڵام دوایی ناکۆکی کەوتە نێوامانەوە.

* لە چاوپێکەوتنێکدا وتبووت روانگە هێلکەیەکی پیس بوو هیچی هەڵنەهێنا، ئەو قسەیەت زیاتر نەبوو بە زەقکردنەوەی ناکۆکییەکانتان؟

– بەڵێ، وەکو وتم، چاوپێکەوتنێکم لەگەڵدا ساز کرا، کاک مارف ناسراو لە کتێبێکیدا ئەوەی نووسیوە، کاتێک ئەو چاوپێکەوتنەی من بڵاو بووەوە کە تێیدا وتبووم، روانگە هێلکەیەکی پیس بوو، هیچی هەڵنەهێنا، خوێنەرانی رۆژنامەی هاوکاری شالاویان بردبووە، سەر کتێبخانەی گەلاوێژ کە خوالێخۆشبوو رەئوف مەعرووف بەڕێوەی دەبرد، جامخانەکەیان شکاندبوو، لەو کاتەدا وەکو مارف ناسراو باسی دەکات، دەڵێ: "چووم بە سەرا جامخانەی کتێبخانەی گەلاوێژ شکابوو، وتم چییە مامۆستا بۆ ئەمە شکاوە؟ وتی وەڵا چووزانم، لەتیف هەڵمەت لە هاوکاریا وتوویەتی، روانگە هێلکەیەکی پیس بوو هیچی هەڵنەهێنا، ئیتر خەڵکی بە لێشاو هاتن، بۆ کڕینی و

جامخانەکەیان شکاند"، ئەوسا خەڵکی ئاوا لە دوای گفتوگۆی رۆشنبیری و دوای رووداوە رۆشنبیرییەکان دەکەوتن، بەڕاستییش من نەموتووە ئەندامانی روانگە هیچیان هەڵنەهێنا، من نە ئەوسا و نە ئێستا ناتوانم بڵێم، حوسێن عارف داهێنەر نەبووە و شێرکۆ داهێنەر نەبووە.

* ئەی بۆچی وات پێ وتن؟

- وەکو گرووپ، وەکو گرووپ هیچی هەڵنەهێنا، هەڵەی ئەوان لەوەدا بوو دەیانویست گرووپەکەیان وەکو حزبێک لێ بکەن، هەمووی یەک دەنگ و سەدای هەبێت و بە هەزاران کەس لێی کۆ ببێتەوە، ناکرێت گرووپێکی رۆشنبیری بریتی بێت لە سێسەد چوارسەد کەس، چونکە هەریەکەو بەجۆرێک دەنووسێ، ئەمە ناکرێ، گرووپی ئێمە چوار بووین و دوای ئەوەی بەیاننامەکەشمان بڵاو کردەوە بووین بە دووان و جیابووینەوە و ئەو جیاخوازییەشمان تێدا ما، ئەگەرچی بەینیشمان هەبوو، مەسەلە ئەوە بوو ئەگینا کاک شێرکۆ وەکو شاعیر، من بمەوێ و نەمەوێ داهێنەرە، بەڵام ئایا تاسەر داهێنەرە؟ ئاخۆ هەندێ جار بەرز و نزمی لەو داهێنانەدا هەیە یان نا؟ ئەوە منیش و خوێنەریش دەیزانین، بێگومان بەلای منەوە وایە مامۆستا حوسێن عارف رۆماننووس و چیرۆکنووسێکی داهێنەرە، بە بۆچوونی من یەکێکە لە رۆماننووس و چیرۆکنووسە هەرە گەورەکانی کورد، ئەو زمانەی حوسێن عارف هەیەتی کەم کەس هەیەتی، نووسین واتە زمان، جا لەبەرئەوە، من وەکو کەسەکانی ناو روانگە نەموتووە، روانگەم وەکو کۆبوونەوەیەکی رۆشنبیری وتووە، چونکە مەبەستی بوو بتوانێ بچێتە ناو هەموو حزبەکانەوە و تەنانەت لەناو حزبەکانیشەوە خەڵک بێنێ بۆ خۆی، بەڵام ئەمەی پێ نەکرا و نەشیتوانی هەموو نووسەران لە خۆی کۆ بکاتەوە، بەڵام حوسین عارف وەکو رۆماننووس، رۆماننووسێکی گەورەیە، شێرکۆ وەکو شاعیر، گەورەیە، کاکە مەم بۆتانی وەکو چیرۆکنووس و رۆماننووس چیرۆکنووسێکی نوێخواز و گەورەیە، من تائێستاش حەز دەکەم، بابەتەکانی بخوێنمەوە و (بوومە لەرزە لە

گۆمێکی مەنگدا) یەکەم کۆمەڵە چیرۆکی کاکە مەم بۆتانییە، کارێکی ئەدەبیی گەورە بوو لە بواری چیرۆکدا، بەڵام ناتوانم بڵێم، روانگە وەکو گرووپێک جێ دەستی دیارە بە ئەتڵەسی رۆشنبیریی کوردییەوە.

* ئەگەر ئەمە ئەندامانی روانگە بن و خۆت وەسفی هەموویان دەکەیت، لە چ دیدێکەوە وتووتە روانگە هیچی هەڵنەهێنا؟

- وەکو گرووپ نەیانتوانی هیچ بکەن، بەڵام وەکو تاکەکەس بەتوانا بوون.

* ئەی لەگەڵ کاک شێرکۆ خۆتان قەت دانیشتوون باسی ئەو سەردەمە بکەن؟

- نەخێر، ئێستا ئەو سەرۆک دەوڵەتە، سەرۆکی دەوڵەتی (سەردەم)ە، منیش بە راستی بیلێیم هەر ئەوەی جارانم، وا بزانم ئەگەر بچم بۆ ناو دەوڵەتەکەی دەوڵەتی سەردەم، باوەڕ ناکەم رێگریی هەبێت و پێشوازیم نەکات، بەڵام من حەز دەکەم شێرکۆ ئا لێرەدا لەم کافتریای ئوتێل ئاشتییەدا کە من و بەڕێزت دانیشتووین لەگەڵ نووسەراندا دانیشێت وەکو چۆن جاران لە ئوتێل کاسبی بەغدا و چایخانەی پەرلەمان لەگەڵماندا دادەنیشت، نەک لەناو دەوڵەتی سەردەمدا، چونکە دەوڵەتی سەردەم شتێکی تر دەدا، ئەگەر ئێمە لێرەدا دانیشین و باسی رۆشنبیری بکەین، وەکو چۆن جاران لە چایخانەی پەرلەمان و ئەلبەرازیلییە و ئەلزەهاوی لە بەغدا دادەنیشتین، ئەمە دەبێتە مایەی پتەوبوونی پێوەندیی رۆشنبیری، یان هەندێ جار لە ژوورەکەمدا لە ئوتێل کاسب لە بەغدا دادەنیشتین باسی رۆشنبیریمان دەکرد، حەز دەکەم کاک شێرکۆ بێتەوە ئەو ئاستە لەگەڵ شاعیر و رۆشنبیراندا دابنیشێ و قسە بکا، رەنگە هەر ئەو هۆیە بووبێ وای لە سیدار سەنگور کرد کە سەردەمێک سەرۆک کۆماری سەنگال بوو، دەستی لە کار کێشایەوە لە سەرۆک کۆمارییەکەی، من وای بۆ دەچم، ئەو سەرۆک کۆمارییە کە نەیهێشتووە تێکەڵی خەڵک بێت، بۆیە وازی هێنا لە پۆستەکەی و وتی، سەرۆک کۆمارێتی

گەلێ بەربژارێتیی رۆشنبیریی لێ وەرگرتوومەتەوە.

* بەڵام لەوەیە سەردەم کەشێکی تر بخولقێنێ بۆ کاک شێرکۆ لە بواری ئەدەبی و دەرکردنی کۆوار و کتێب و پەرەدان بە رۆشنبیری و... هتد.

– کوا؟ کتێبێکی زۆر باشم پێ بڵێ لە سەردەم دەرچووبێ، کۆوارێکی دەگمەنم پێ بڵێ وەکو کۆواری (شیعر ٦٩)ی عێراقی، یان وەکو کۆواری (شیعر)ی لبنانی کە بارودۆخی رۆشنبیریی گۆڕیبێ، هەر ئەوە نییە ئێمە لاپەڕیەکی پێ پڕ بکەینەوە، ئێستا کۆوارێک لە جوگرافیای رۆشنبیریی سەرجەم هەرێمدا نابینم کە دەوری هەبێت لە گۆڕنکارییەکی رۆشنبیریی گەورەدا، ئەم هەموو کۆوارە هیچی کاریگەرییان نییە، من کاتی خۆی لە رۆژنامەی هەرێمدا کە نووسەر بووم، تێیدا، بابەتێکم بڵاو کردەوە، باسی ئەوەم کرد با یەک کۆوار دەرچێت و وەکو کۆواری شیعر ٦٩ی عێراق و ئادابی بەیرووتی بێت و وەرچەرخانی رووناکبیری بەرپا بکا، نەک سەدان کۆوار و رۆژنامە دەرچێت و هیچ گۆڕانکارییەک بەرپا نەکات، ئەوانەی لە سەردەمدا دەردەچن، یەک کۆوارم پێ بڵێ گۆڕانکاریی کردبێ، ئەوەش شوورەیی و کەمی نییە بۆ سەردەم، چونکە ئاستی کوردستان هەمووی وایە.

* لە کاتێکدا هەمووی وابێ، چۆن دەتوانین گلەییی لێ بکەین؟

– وەکو گلەیی نایڵێم، ئەگەر کاک شێرکۆ بتوانێ بێتە ناو خەڵکەوە و پێوەست نەبێ بەو کاروبارانەیەوە، رەنگە ئێمە بتوانین بیرێکی تر بکەینەوە و کۆوارێک دامەزرێنین وەرچەرخانێک دروست بکا، ئەم چەقبەستنە تاکەی؟

* تۆ بۆ دەستپێشخەری ناکەیت و ئەو پێشنیازە بخەیتە بەردەست کاک شێرکۆ؟

– من هەر گەنجە سەرگەرمەکەی جارانم، بەڕاستی حەز ناکەم خۆم بخەمە

ئەو بارودۆخـەوە، من حـەزم دەکـرد کـاک شـێـرکـۆ کـە ئێـسـتـا زیاتر چووەتە تەمـەنەوە خـۆی کـۆبوونەوەیەک بە نووسـەران و هـاوڕێیان و ڕۆشنبیران بکا و بڵێ ئەم چەقبەسـتـنە تاکەی؟ با کـارێک بکەین، بەسـتـەڵەکی چەقبەسـتـووی ڕۆشـنبـیـری بشـکێنین و خـۆشی چاک دەزانێ کێ دەتوانێ ئەو بـەسـتـەڵەکـە بشکێنێ، دەتوانێ ئەو کەسانە هەڵبژێرێ و دەستنیشانیان بکا.

* وەکو بزانیت بۆچی شتێکی وا ناکات؟

– نازانم، بڵێی هـی ئەوە بێت، چووبێتە تەمەنەوە، یان بڵێی کاروباری سەردەم سەرقاڵی کردبێ، لەوانەیە.

## گرووپی پێشڕەوی هەولێر

* هەر لە نـووسـینێکـتـدا، باسـی گـرووپـی هەولێـر دەکـەی، عـەباس عەبدوڵا یووسف و هـاوڕێکانی ئەمانە چییان لە هەگبەدا بوو؟

– با سەرەتا شـتێک بلێم، عەباس عـەبدوڵا یووسف و هـاوڕێکانی، پێش ئەوەی ببن بـەگـرووپ دەمناسـی کـەسـێکی ڕۆشـنـبـیـر و نوێخـواز بوو، لـە یەک دوو دانیـشـتندا ئەوەم بـۆ دەرکـەوت، ڕۆشنـبـیـرێکی سـەرگـەرم بوو، ئـەو بەهرە و توانایەیم لە شـیعرێکدا بـەدی کرد کە بە ناوی (ئاو)ەوە بـڵاوی کردەوە وا بزانم سـاڵی ٧٤ و ٧٥ بڵاوی کـردەوە، دواتـر کـۆمـەڵێکی تـری بڵاو کـردەوە وا بزانم هۆنراوەیەکی درێژ بوو (لم نیـازمـە)، بەهرەکەی لەو دووانەدا دەرکـەوت، پێش ئەوەی بچێتە بواری ئەوەی ئەویش گرووپێک لەگەڵ ئەنوەر مەسیفیی ڕەحمەتی و هـاشم سـەڕاج و چەند برادەرێکی تریدا دابمەزرێنێ، من سـەرەتا حیساب بۆ کەسـەکان دەکەم، دواتر بۆ گرووپ، ئەنوەر مـەسیفیش لە (خـۆڵ باران)دا شتی جوانی بەشێوازێکی نوێوە خستە ڕوو، دواتریش لە بەرهـەمەکانی تریدا هـەوڵی زۆری هەبوو لە بواری نوێـگەریدا، هـاشم سـەڕاجیش یەکێکە لەو شـاعیرانەی جێ دەستیان هەبوو لەو هێڵە نوێگەرییەدا کە خۆیان دەیانویست، بەڵام ئەوەی

راستی بێ، من زیاتر وا هەست دەکەم ئەوان حەزیان کردووە لاسایی تەواوی تەوژمە تەجریدیە شیعرییە ئەوروپاییەکان بکەنەوە، ڕەنگە من ئەو لاساییکردنەوەیەم پێ خۆش نەبێ، ئەگەرچی بایەخی هونەری و ئەدەبی بۆ دادەنێم، لەو ڕوانگەیەوە ئەوان ئاگەداری ڕۆشنبیریی ئەوروپی بوون، ئەم قسەیەشم هەروا بەخۆڕایی ناکەم، ئێستا عەباس عەبدوڵا یووسف و هاشم سەراجیش گەڕاونەتەوە، دۆخێکی تری شیعر، لە قاوغی ئەو لاساییکردنەوەیە دەرچوون و ئێستا بە زمانێکی تر شیعر دەنووسن، ئەم زمانە و ئەم شێوەیەیان لەو شێوەیە دەچێ کە ئێمە لە حەفتاکان و هەشتاکاندا پێمان دەنووسین و ئێستا پەرەمان پێ داوە، ئەوانیش هاتوون جۆرێک لە جۆرەکانی ئەو شێواز و زمانە دەنووسن، ئەمەش ڕاستیی ئەو قسەیەم دەردەخات کە پێشتر لاسایی ئەوروپاییەکانیان دەکردەوە، دیارە خۆیان هەستیان بەوە کردووە و زمانی ڕاستەقینەی خۆیان دۆزیوەتەوە، لە هەموویان زیاتریش ئەنوەر مەسیفی زۆر ئەو لاساییەی بەکار دەهێنا، بەداخەوە کۆچی دوایی کردووە، ئەگەر ئەویش ئێستا بمابایە دڵنیام شێوازی نووسینی خۆی گۆڕیبوو، وەکو گرووپیش باسیان بکەم لە کاتی خۆیدا دەنگێکی گەورەیان دایەوە و بە خەستوخۆڵی و چڕی و بەربڵاوییش لە ڕۆژنامە و کۆوارەکانی ئەو سەردەمەدا باس کران و دەستنیشان کران و باسی بەرهەمەکانیان کرا، ناشکرێت ئەو کۆمەڵە یان گرووپی پێشڕەو لەو سێیان چوارەدا کورت بکەینەوە، بگرە هەندێ برادەری تریشیان لەگەڵ بوو، لەوانە ڕۆستەم باجەلان، سەباح ڕەنجدەر، ئەگەر ئەمانە لە دەرەوەی گرووپەکەش بووبێتن، بەڵام لە زمانی نووسین و بیرکردنەوەدا یەکبوون و "زێوان"ی سەباح ڕەنجدەر، دیوانێکی گەشاوەیە، لەو بوارەدا و من دڵنیاشم وەکو چۆن ناکۆکی و جیاوازیی ڕۆشنبیری و شێوازی نووسین لە نێوانی ئەندامانی کفری و ڕوانگەدا هەبوو، هەروەها لە نێوانی ئەندامانی کفری خۆیاندا و لە نێوانی ئەندامانی ڕوانگە خۆیاندا هەبوو، بەو جۆرەش جیاوازیی نووسین و بیرکردنەوە لەنێو گرووپی پێشڕەوی هەولێریشدا هەبوو، گرووپە

ئەدەبییەکانیش وەکو حزبە سیاسییەکانن، لە هەندێ شتی سەرەکیدا، ڕێک دەکەون، بەڵام لە هەندێ شتی لاوەکیدا جیاوازییان دەبێ، یان بەپێچەوانەوە، بەڵام هەر یەکیش دەگرن بەمەبەستی ئەوەی ئەو بیرۆکەی کە هەیانە بیخەنە ڕوو و بڵاو ببێتەوە لەناو خەڵکیدا، بەڵام من گلەییم لەوە هەیە زۆرجار بەشێوەزاری ناوچەیی دەنووسن.

* تۆ هەردەم خۆت بە نوێخواز دەزانیت و دژی کۆن، بەڵام لە نووسینێکتدا لۆمەی ئەوانە دەکەی کە لە دەرەوە ژیان و هاتوونەتەوە جۆرێک لە قسەکردن و ئاکاریان گۆڕاوە، بۆچی؟

– هەموو نووسینێک و نوێگەرییەک دەبێ بنەمایەکی خۆماڵیی هەبێت، یەعنی ئێمە نوێگەرین، نابێ ئێمە لە بنەما سەرەکییەکانی زمانەکەمان یاخی ببین و تێکی بشکێنین، بەو جۆرە ئێستا هی وا هەیە، چوار پێنج کتێبی بڵاو کردووەتەوە، بەڵام کوردی نازانێ، ئەو ڕستانەی کە نووسیونی کوردی نین، ئەوروپین یان عەرەبین، بەلای منەوە هەموو نووسینێک دوو دەق نییە وەکو ئەوەی تۆدۆرۆف و هاوبیرەکانی دەیڵێن، بەڵکو سێ دەقە، دەقێک زمانەکەیە، دەقێک نووسینەکەیە، دەقێک خوێنەرەکەیە، من وەکو خوێنەرێک کە دەیخوێنمەوە هەست ناکەم کوردییە و بە کوردی دانەڕێژراون، لە نووسینی هەندێ لەوانەدا کە لە ئەوروپا دەژین و دەنووسن ئەو حاڵەتە بەدی دەکەم، حاڵەتی سێیەم نییە دەقەکانیان نەبووە بە کوردی.

## شیعر

* دانیشتنی یەکەم گفتوگۆیەکی گەرممان کرد بەتایبەتی لەسەر نوێبوونەوە و گرووپی کفری و ڕوانگە، دانیشتنی ئەم جارەمان پێم خۆشە باس لە شیعر و بەرهەمەکانت بکەین، باشە شیعر چییە؟ بەچی دەڵێن شیعر؟

- ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ئەو پێناسە ئەکادیمییانەی کە لە قوتابخانەکان و ڕێبازە ئەدەبییەکاندا بۆ شیعر کراوە، دەبێ بڵێین شیعر ڕستەی کێشدار و سەرواداره وەکو عەرەب دەڵێ (کلام موزون مقفی)، بەڵام ئەمە بەلای منەوە پێچەوانەی شیعرە، ئەگەر شیعر خەیاڵ بێت، ئەوا بەشێک لە واقیعیشی تێدایە، ئەگەر شیعر واقیع بێت، ئەوا بەشێک لە ئەفسانە و داستان و لە خەیاڵی باو و خەیاڵی ناباویشی تێدایە، بە ڕاستی جگە لەوانەش شیعری جوان و سەرکەوتوو پێشانگەیەکە پڕە لە تابلۆی جوان، ناکرێ شیعرێ بنووسین و تابلۆکاری تێدا نەبێ بە وشە، لەبەرئەوە کێش و سەروا لای من بەشێکی گرینگی شیعر نییە.

* واتا وێنەی شیعری.

- بەڵێ وێنەی شیعری، نابێت شیعرێ بنووسین و وێنەی شیعریی تێدا نەبێت و بڵێین شیعرێکی سەرکەوتووە، جا شیعر بە بڕوای من برێتییە لە خەیاڵ و وێنەی شیعری و لە شتێک لە شتەکانی واقیع و لەو ژیانە ئاساییەی کە تیای دەژین و لە ئەفسانە و داستان، من و هەندێ شاعیری تر توانیومانە وەکو هەندێ بارودۆخی شانۆ و فلیمسازی و کۆلاج و دۆبلاج و کاریکاتێر و پۆستەر و، ئەم بابەتانەی هونەرەکانی تریش بگوێزینەوە ناو جەستەی شیعر و بیانکەین بە کەرەستەگەلێک لە کەرەستەکانی جەستە و بەرجەستەکردنی شیعر، ڕەنگە بڵێین ئاخۆ شیعر کێش و سەروای پێویستە؟ من دەڵێم ئەگەر شیعرەکە خۆی لەگەڵ خۆیدا جۆرێک لە جۆرەکانی کێش و سەروای هێنا، با بێت، ئەگەر نا، هەرگیز کێش و سەروا بەشێک نییە لە هەلومەرجی شیعر، دەتوانین سەدان شیعر بەنموونە بێنینەوە کە کێش و سەروای نییە و شیعرە، بۆ نموونە، من گەلێ لە بەشی ئینجیل و تەورات و گاتاکانی زەردەشتم هەیە، دەیخوێنمەوە، بێگومان گاتاکانی زەردەشت کراون بە کوردی یان بە عەرەبی، تەورات و ئینجیلیش هەر لە ڕێگەی زمانی عەرەبییەوە، شیعرییەتی لە سەدا سەدیان تیا بەدی دەکەم، کە کاتی خۆی بەشیعر نەنووسراون ئەمانە کێش و

سەرواى شیعریان نییە، جگە لەوەش من لە گەڵێ سوورەتی قورئانی پیرۆزدا کە کێش و سەرواشی نییە، شیعرییەتی لە سەدا سەد بەدی دەکەم و ئەمە خۆی لەخۆیدا بابەتێکە و لێکۆڵینەوەیەک و دووان و سیان یان دەرەقەتی نایەت، بەڵام ئەمە کورتەی بیر و بۆچوونەکانمە، ئەگەر بڵێین کێش و سەروا بابەتێک دەکات بە شیعر، ئەوا ئێمە ئەگەر ئەلفییەی ئیبنولمالیک بخوێنینەوە، بێگومان هیچ جۆرە شیعرێکمان تێدا دەست ناکەوێ، ئەگەرچی کێش و سەرواشی تەواوە، هەروەها فەرهەنگی ئەحمەدی شێخ مارفی نۆدێ، بخوێنینەوە، هیچ شیعرێکمان تێدا دەست ناکەوێ، هەرچەند کێش و سەرواشیان هەیە.

* وەکو خۆت وتت، عەرەب دەڵێ، ئەوە شیعرە کە کێش و سەرواى هەبێ، تۆش کە دەستت کردووە بە شیعر نووسین بە شیعری نوێ و بێ کێش و سەروا، دەستت پێ کردووە، خۆت نەبەستووەتەوە بەو گرێوگۆڵانەی کە بۆ شیعرنووسین دانراون، لە سەردەمی پێش ئێوە، بەو پێیە بێت ئەو شیعرە بێ کێش و سەروایانەی تۆ دەینووسیت ناکەوێتە قالبی شیعرەوە، تۆ دەڵێی چی؟

– نەتەوە هەیە، شیعری هەر کێش و سەرواى نییە، شیعری عیبری، وەکو لە گەلێ سەرچاوەدا خوێندوومەتەوە، هەر لە سەرەتاوە کێش و سەرواى نەبووە، بە بۆچوونی من عەرەبیش لە پاڵ شیعری کێش و سەروادارردا شیعری بێ کێش و سەرواى هەبووە، ئەگینا عەرەبەکان بە قورئانیان نەدەوت شیعرە و ئەمە قسەی شاعیرە، ئەگەر هاوکووفی سوورەتە پیرۆزەکانی قورئان، شیعرێکی بێ کێش و سەروا نەبووایە، لە جەزیرەی عەرەبیدا پێشتر، یان هاوچەرخی قورئان بێگومان عەرەب نەیدەوت قورئان شیعرە.

* لەوەیە ئەوان لە رووی رەوانبێژی و بەهێزی زمانەکەیەوە ئەو قسەیان کردبێت، نەک لە رووی کێش و سەرواوە.

- بەڵام شتی تریش بووە، ئومەیەی کوڕی سەلەت، زۆر ڕەوانبێژ بووە و وتاربێژێکی باشیش بووە لەو سەردەمەدا، هەروەها کاهینەکانی ئەو سەردەمە کە گەلێ دەقیان ماوەتەوە و لە کتێبی مێژوویی عەرەبیدا زۆرە، بەڵام عەرەب بە ئەوانەی نەوتووە شیعر خۆ ئەوانەش وەکو قورئان بێ کێش و سەروا بوون، ئەوانەیان بە قسە و بە گوتار داناوە یان بە گوتەزایەکی ئاینی لە قەڵەم داوە، بەڵام ڕاستەوخۆ بە قورئانیان وتووە، ئەمە قسەی شاعیرە و ئەمە شیعرە، لەبەرئەوە، من سوورم لەسەر ئەوەی هاوچەرخی قورئان، یان پێش قورئان عەرەب شیعرگەلێکی بووە، بێ کێش و سەروا نووسراون.

* شیعرێک ماوە هی ئەو سەردەمە بێت و بێ کێش و سەروا بێت و بیکەین بەبەڵگە؟

- بێگومان ئێستا لەم کافتریایەدا ئەو سەرچاوانەم لە بەردەستدا نییە، من ئەوانەم لە بیر نییە، هاوچەرخی قورئانی پیرۆز یان پێش قورئان بن، تەنیا خوتبەکانی ئومەیەی کوڕی سەلەت و گوتەزای کاهینەکان نەبێ، بەڵام لە سەردەمی عەباسییەکاندا بە بۆچوونی من تەواسینەکانی حەلاج، دەچێتە خانەی شیعرەوە و گەلێ گوتەزای سۆفیگەری کە کێش و سەرواشیان نییە، دەچنە خانەی شیعرەوە، هەرگیز مرۆڤ بەجلوبەرگەوە مرۆڤ نییە، هەروەها شیعریش بەکێش و سەرواوە شیعر نییە، جلوبەرگ بووە بە خەسڵەتی دەرەوەی مرۆڤ و کێش و سەرواش بووە، بەخەسڵەتێکی ڕواڵەتیی شیعر، نەک بەرجەستە بووبێ و لەگەڵیدا بێت، چۆن جلوبەرگی مرۆڤ خوازراوە، کێش و سەروای شیعریش، خوازراوە.

* کەواتە شیعر ناوەڕۆکە.

- شیعر ناوەڕۆکیشە و شێوەشە، کاتێ لافاو دێت خۆی دەزانێ چۆن ڕێگەی خۆی دەکاتەوەو چ ڕێگەیەک بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ، کاتێ شیعریش دێت، خۆی دەزانێ چ ڕێگەیەک بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ، چ قالبێک، چ شێوەیەک، شێوەی بێ

کێش و سەروا یان کێش و سەروادار، ناوەڕۆک دەتوانێ ئەوە بەرجەستە بکا، شیعر ناوەڕۆک نییە، شیعر شێوازە.

* کەواتە ناتوانین پێش وەخت وەکو لە کلاسیکدا هەبووە، شێوە دانێین بۆ شیعر؟

– هەرگیز دانەنیشتووم، بڵێم شیعرێک دەنووسم بێ کێش و سەروا یان کێش و سەروادار، خۆی چۆن هاتبێ ئاوا نووسیومە، زۆر ئاساییە و هەردووکیشی بەشیعر دەزانم.

* ئەی ئەو زمانەی شیعری پێ دەنووسرێ، دەبێ چ زمانێک بێت؟

– ئەو زمانە دەبێ رەخنەگران دیاریی بکەن، پێشتر شتێکم وت، دەبێ شیعر برێک لە خەیاڵ و ئەفسانە و هونەرەکانی تری تیا بێت و ئەو شتانەش زمانەکە دیاری دەکەن، زمانی موتەنەبی زۆر جیایە لە زمانی جەواهیری، بەڵام هەردووکیشیان شیعرن و هەردووکیشیان کێش و سەروایان هەیە، زمانی محەمەد ماغوت لەگەڵ زمانی ئینس ئەلحاج زۆر زۆر جیایە و هەردووکیشیان زۆر بایەخیان بە کێش و سەروای کلاسیکی و باوی شیعر نەداوە، زمانی هەردوو شاعیری سۆفی حەلاج و ئیبن عەرەبی زۆر ئاسانە و بە ئاسانی لێی تێ دەگەیت، بەڵام هەریەکە و کەرەستەی تایبەتی خۆی هەیە لە زماندا و بەکاری دێنێت، لەلای خۆشمان زمانی گۆرانیش و نووری شێخ ساڵحیش هەردووکیان زمانێکی رەوان و ئاسانن، بەڵام هەموو کەسێک ناوێرێ بەو زمانە بنووسێت، هەردووکیشی زمانی شیعرییە، ئەوە گرینگە هەر شاعیرێک و زمانێکی خۆی هەبێ، زمانی شێخ رەزا و مەحوی زۆر جیان لەیەک، زمانی بێخود جیایە لە زمانی مەحوی، گرینگ ئەوەیە بۆنی شێوەزاری ناوچەیی لە شیعرەکانیاندا ناکرێ و بەزمانی ستاندارد نووسیویانە.

## شێخ ڕەزای تاڵەبانی

* باسی شێخ ڕەزات کرد، دەزانین شیعری نەتەوەیی هەیە، بەڵام زۆربەی شیعرەکانی دەچنە بواری داشۆرینەوە، دەوترێ ئەگەر شێخ ڕەزا نەبووایە، کورد ئەو مەبەستە شیعرییەی نەدەبوو، بەڵام لە هەمان کاتدا مەستوورە و (نالی)یش بەنامەی شیعری یەکتریان داشۆریوە.

– مەستوورە و نالی لە بواری داشۆریندا شتێکی شەخسی بووە لە نێوانیاندا، یان شتێکی مەزهەبی بووە، من دڵنیا نیم مەستوورە لەسەر مەزهەبی، شیعە بووە یان سوننە، خۆ ئەگەر مەستوورە خانم لەسەر مەزهەبی شیعە بووبێت دڵنیا بە ئەو هەجووەی نالی کردوویەتی مەسەلەی مەزهەبگەرایی بووە، ئەگەر سوننیش بووبێ مەسەلەی عەشرەتگەرایی بووە، نالی سەر بە ئیمارەی بابان بووە، بەڵام مەستوورە خان سەر بە ئیمارەی ئەردەڵان بووە، لەو سەردەمەدا ناکۆکیی عەشایری بووە، زیاتر سیماکانی عەشرەتگەرایی زاڵ بووە بە سەر نەتەوەگەریدا، هەر بۆیەش تەنانەت لەناو بابانەکان خۆیاندا شەڕ و ئاژاوەی پلە و پایەی ئیمارەتەکە هەبووە، هەروەها لەناو ئەردەڵانەکانیشدا هەبووە شیعرە داشۆرینەکانی نالی و مەستوورە، شەڕەجوێنێکی کاتی بووە، نالی هەر ئەو شیعرە درێژەی هەیە و دەیەوێ مەستوورە خانمی پێ سووک بکا، بەڵام شێخ ڕەزا شاعیری داشۆرین بووە ئێستا نازانم بۆ؟ هونەرمەندانی کاریکاتێر لە زۆر شتدا کار دەکەن، ڕۆژێک لە ڕۆژان بیریان لەوە نەکردووەتەوە شیعرێکی شێخ ڕەزا بکەن بە وێنەی کاریکاتێری، من دەڵێم هونەرمەندانی کاریکاتێری کورد شیعر ناخوێننەوە، ڕەنگە شێوەکارەکانیش، چونکە کەم جار یەکێ دووانیان دەبینم لە کۆڕێکی شیعریدا ئامادە بێت، بەڵام ئێمەی شاعیر هەردەم دەچین بۆ پێشانگەکانی ئەوان، چونکە من سوورم لەسەر ئەوەی هونەری شێوەکاری بەشێکە لە شیعر، بەڵام ڕەنگە برایانی شێوەکار و کاریکاتێریست باوەڕیان وا نەبێ شیعر بەشێکە لە هونەری کاریکاتێر و

شێوەکاری، شێخ ڕەزا شیعرێکی هەیە دەڵێ: هێندە شاعیر زۆر بووە لەم عەسرەدا، بووەتە حەشری نێرەکەر لەم حوجرەدا، ئەمە لایەنی زۆر دەگرێتەوە، یەکەم: کۆمەڵێ شاعیری زۆر هەبوون لەو سەردەمەدا کە شیعریان وتووە، بەڵام لە هەموویاندا شێخ ڕەزا خۆی ماوەتەوە، ئێمە بەبێ هیچ سێ و دوویەک دەتوانین بڵێین حوجرەکان بەتایبەتی ئەو حوجرانەی شێخ ڕەزا ئاشنای بووە هەر نێرینە تیایاندا خوێندووە و ڕێگە نەدراوە مێینە بخوێنێ و فێری خوێنەواری بێت، چونکە دەڵێ بووەتە حەشری نێرەکەر لەم حوجرەدا، خۆ ئەگەر مێینەشی تێدا بووایە ڕەنگە شتێکی زۆر خەتەری بوتایە، ئەوە شێخ ڕەزایە قالب و سنووری بۆ دانانرێ، بە بۆچوونی من شێخ ڕەزا یەکێکە لە شاعیرە هەرە گەورەکانی ڕۆهەڵات و لە ئینسکلۆپیدیای تورکیدا، بایەخێکی گەورەی پێ دراوە و شەڕە لە سەری، ئەوان بەتورکی دەزانن، ڕەنگە تورکمانەکانی عێراقیش بەتورکی بزانن، لەبەرئەوە شێخ ڕەزا تاقە سوارێکە لە بواری شیعری داشۆریندا و پێی سەرسامم، لەگەڵ ئەوەشدا لە شیعرەکانی تریشیدا هەر بالادەست بووە، شیعری / لە بیرم دێ سولەیمانی کە دارولمولکی بابان بوو/ یەکێ لەو شیعرانەیە کە دەبێ ئێستا سروودی نیشتمانیمان بێت، لێرەشەوە پێشنیاز دەکەم بکرێ بەسروودی نیشتمانی.

ئەوەش دەبێت و هەندێ جار ژیان و نێوانی شاعیر و ڕۆشنبیر بەشەڕەجنێوەوە خۆشە، بزانە ناکۆکیی نێوان نالی و مەستوورە خانم بووەتە هۆی ئەوەی ئەو شیعرە جوانانە بنووسن بەتایبەتی شیعرەکەی نالی کە وای کردووە زیندوو بمێنێتەوە، لە بواری داشۆریندا، هەروەها ناکۆکیی کۆمەڵگەی کوردەواری و شێخ ڕەزا، بووەتە هۆی ئەوەی کە هەموو ئەو شیعرە جوانەی شێخ ڕەزا مێژوویەک بۆ کورد تۆمار بکا.

* کەواتە بەڕێکەوت نەبووە، شیخ ڕەزا شیعری داشۆرینی هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە؟

– بە تەعبیری ئەوسا منەوەر، بە تەعبیری ئێستا ڕۆشنبیرێکی هەرە گەورەی

سەردەمەکەی خۆی بوو، بە بۆچوونی من لە رۆشنبیریدا لەو سەردەمەدا کەس هاوتای نەبووە، ئەگەر هاوچەرخی نالی و سالم و (کوردی)یش بووایە، ئەوانیش هاوتای شێخ رەزا نەبوون لە رۆشنبیریدا، ئەو لە تەکیەی تاڵەبانیدا گەورە بووە کە تەکیەی مام و باو و باپیری بووە، تەکیەی تاڵەبانی باوەڕت بێ وەکو زانکۆی ئەزهەری میسری وا بووە تەها حوسێن و سەدان نووسەری گەورەی تری پێ گەیاندووە، تەکیەی تاڵەبانییش، دەیان بلیمەت و گۆرانیبێژ و دەیان کەسایەتیی گەورەی پەروەردەی رۆشنبیرییەکی هاوچەرخ کردووە، تەکیەی تاڵەبانی لە کەرکووک، تەکیەیەکی قادری بووە لە ئەستەمبوڵەوە لە بەغداوە لە مووسڵەوە لە شامەوە لە پاکستانەوە لە هیندستانەوە رۆشنبیرانی ئەوسا روویان تێ کردووە، جگە لەوەی لە هەموو شارەکانی کوردستانیشەوە روویان تێ کردووە، شێخ رەزاش لە ناو ئەوانەدا ژیاوە و پەروەردەی ئەو تەکیەیە بووە کە زانکۆی بێ هاوتای ئەو سەردەمەی ئەم ناوچە بووە و تەکیەی تاڵەبانی، گەواهی دەدات کە کەرکووک کوردستانە.

* شێخ رەزا وەکو پێویست گرینگیی پێ دراوە؟

– رەنگە شێخ رەزا لەچاو هەندێ شاعیری تردا زیاتر گرینگیی پێ درابێ، بەڵام گرینگ ئەوە نییە، ئێمە بێین دیوانەکانی شێخ رەزا شەرح بکەین، یان بڵێین ئەم شیعرەی لە فلان ساڵدا وتووە، یان بۆ فلان کەسی وتووە.

* ئەی گرینگ چییە؟

– گرینگ ئەوەیە، بێین جوانکاریی شیعرەکانی شێخ رەزا لێک بدەینەوە، تا ئێستا رەخنەی ئەدەبی نەیتوانیوە خۆی لە قەرەی لایەنی هونەریی شیعری شێخ رەزا بدا، ئەمە شتێکی گرینگە کە نەدەبوو پشتگوێ بخرێ، تەنانەت مێژووی ئەدەبی کوردی و ئەوانەی باسی شیعری شێخ رەزا دەکەن، هەروەها ئەو دیوانانەی شێخ رەزا کە لە دە ساڵی رابردوودا دووبارە و سێبارە چاپ کرانەوە، هەر شەرحە و خۆیان نەداوە لە هونەری جوانکاریی شیعری شێخ

ڕەزا، لە ڕووی جوانکارییەوە لە سەردەمی خۆیدا ڕەنگە لە تۆفیق فیکرەت و یەحیا کەمالی تورک، کە ئەوان لە دەرەوەش ناسراوبوون، ڕەنگە زۆر لێهاتووتر بێت.

* بوێرییەکی زۆری ویستووە، لەو سەردەمەدا کەسێک لە کۆمەڵگەیەکی نەریتی و ئاینی و دواکەوتووی وەک کوردستاندا بە شێوەی شێخ ڕەزا شیعر بنووسێ؟

– شێخ ڕەزا گەورەترین شۆڕشگێڕی سەردەمەکەی خۆی بووە، شیعرەکانی شێخ ڕەزا دەیسەلمێنن کە لەو سەردەمەدا دیموکراسییەت و وەرگرتنی بیری نوێ، زیاتر ئامادەگیی بۆ کراوە وەک لە ئێستا، ئێستا دەڵێین کۆمەڵگەی مەدەنی و کەچی لە پرسە و ئاهەنگ و کۆڕ و سیمینار و شوێنە گشتییەکاندا دەیان کەس بەچەکەوە دەوەستن و دەشڵێین کۆمەڵگەی مەدەنی و بەڵام خەڵک بە ترسەوە قسە دەکات، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو دەمە لێبووردەیی زیاتر بووە و شێخ ڕەزا بەو ڕەهاییە قسەی کردووە و جنێوی داوە، جنێوی بە مامی خۆی داوە، دەڵێت/ مامەکەم قەحبە ژنە، مولکی شەدادی هەیە/ لەگەڵ ئەوەشدا لێی قبووڵ کراوە، هەروەها جنێوی بە عەشیرەتی کاکەیی و جەباری داوە و ئیهانەی بیروباوەڕی کاکەیی کردووە، بەڵام هەر لێشی قبووڵ کراوە و وەکو گەشتیارێکیش بە هەموو شار و شارۆکەکاندا گەڕاوە و کەسیش ڕێگەی لێ نەگرتووە، مانای وایە دیموکراتییەت و ڕەهایی هزر و بیر، ئەوسا زەوینەیەکی فراوانتری هەبووە وەک لە زەمینەی حزبایەتیی ئێستا، بەڕاستی حزبایەتی دیموکراتییەتی زیندەبەچاڵ کردووە.

* ئاواز و مۆسیقا چی بە شیعر دەدەن؟

– هەندێ جار هیچ، هەندێ جار ئاواز و مۆسیقا، وەکو باسمان کرد، فەرهەنگی ئەحمەدی ئاواز و مۆسیقاشی هەیە و شیعر نییە، ئەلفیەی ئیبنولمالیک ئاواز و مۆسیقاشی هەیە، بەڵام شیعر نییە، دەیان شیعریش هەن

ئاواز و مۆسیقاشیان هەیە و هەر شیعر نین، لە شیعری عەرەبیدا سەردەمێک هەیە پێی دەوترێ، سەردەمی تاریکی، شاعیرانی ئەو سەردەمە زۆر پێوەست بوون بەکێش و سەرواوە، بەلاّم شیعری ئەو سەردەمە بە لاوازترین شیعری عەرەبی دادەنرێ.

* ئەفلاتوون دەلّێ ئەو قسانەی شاعیر دەیکات، خواوەندێک پێی رادەگەیەنێ، واتە قسەی شاعیر (هی) خۆی نییە.

- من دەلّێم شاعیر خۆی خواوەندێکە، هەموو شاعیرێک خۆی خواوەندی شێوازی شیعری خۆیەتی، هەر لە کۆنەوە ناکۆکی لە نێوان شاعیران و فەیلەسووفاندا هەبووە و ناکۆکی لە نێوان خوای مەزن و شاعیرانیشدا هەیە، ئەفلاتوون لەناو کۆمارەکەیدا جێگەی شاعیرانی نەکردووەتەوە ئەو دەلّێ دەبێ شاعیران لە دەرەوەی کۆمارەکەیدا بژین، ئەو بۆچوونی وایە شاعیر مرۆڤێکی ئاسایی نییە و کەسێکی سەرکێش و سەرشێتە و پێوەست نییە بە سیستەم و رێژیمەوە دەبێ لە دەرەوەی کۆمارەکەیدا بێت، چونکە کۆمارەکەی پێوەستە بە سیستەم و بە یاساوە، بەلاّم شاعیر پێوەست نییە بەسیستەم و بە یاساوە. ئەمە تا سەردەمی قورئانیش بەردەوام بووە، بەلاّم لە قورئانی پیرۆزدا شێوازی بۆ دانراوە، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا، رەفزی شاعیر دەکات، دەلّێ، کۆمەلّێ خەیالاّوی و لە رێ دەرچوو، دوایان دەکەون، بەلاّم هەلومەرجێک دادەنێ بۆ شاعیری باش کە باوەڕیان بە ئاینی ئیسلام هەیە و چاکەخوازییان زۆرە، لە دوای دەیان سەدە لە دوای ئەفلاتوون بۆچوونی قورئان گۆڕاوە بەرامبەر بە شاعیر، ئەفلاتوون لە کۆمارەکەیدا بە تەواوی شاعیران رەفز دەکات بە سەرکێش و ناسەرکێشەوە، بەلاّم قورئانی پیرۆز تەنیا سەرکێشەکان رەفز دەکات و خەتی راست و چەپیان پێدا دەهێنی و رەخنەیان لێ دەگرێ، بەلاّم ئەو شاعیرانەی کە باوەڕدارن و چاکەخوازن، جێگەیان دەکاتەوە و بایەخیان دەداتێ، بەلاّم نالّێ لە کۆمەلّگەی ئیسلامدا جێیان نابێتەوە، بگرە رەهایان دەکات لەم رووەوە ئیسلام دیموکراتییانە مامەلّەی

لەگەڵ شاعیراندا کردووە، بەڵگەی تریش هەیە لە قسەکانی پێغەمبەردا (د.خ) من بەپێچەوانەی ئەدۆنیسەوە، قسە دەکەم، شیعر مەرغووب بووە لە ئیسلامدا، ئەدۆنیس دەڵێ: ئیسلام هات شیعری کوشت، دینەکان شیعریان کوشت، بەڵام من بەپێچەوانەوە، دەڵێم دینەکان شیعریان زیندوو کردووە، چونکە دەقە ئاینییەکان خۆیان شیعرن، هەر بۆ نموونە لە شەڕی ئوحوددا؛ موسڵمانەکان خەریک بوو تێک بشکێن، حەسانی کوڕی سابیت کەوتە هەجووکردنی قورەیشییەکان، پێغەمبەر وتی: هەجوویان بکە بە شیعر ئەی حەسان، دایک و باوکم بەقوربانت بێت، تەها حوسێن دەڵێ، پێغەمبەر هەتا کۆچی دوایشی کرد بەکەسی نەوت دایک و باوکم بەقوربانت بێت، بەحەسان نەبێت، ئەویش لەبەر ئەو شیعرانە و ئەو شیعرانەش هەمووی جوێنی ناشیرین بوون و تەها حوسێن دەڵێ: جوێنەکان ئەوەندە رووتن، رووم نایە بیانخەمە سەر کاغەز، جا ئیتر نازانم هەندێ لە رێبەرانی مینبەری لای خۆمان بۆچی دوژمنایەتیی شیعر دەکەن.

## شاعیر

* ئەی جیاوازیی نێوان فەیلەسووفێک و شاعیرێک چییە؟

– هیچ شیعرێک نییە فەلسەفەی تێدا نەبێ، ئەگەر هەر هیچ فەلسەفەیەکی تێدا نەبێت، فەلسەفەی جوانکاری تێدایە، بەڵام شاعیریش هەبوون، فەیلەسووف بوون لەوانە ئیبن سینا و فارابی و مەعەڕی، سەیر ئەوەیە ئەو شاعیرانەی فەیلەسووف بوون وەکو شاعیر نەیانتوانیوە جوانکاریی شیعری بەکار بێنن بۆ نموونە ئەبولعەلائی مەعەڕی فەیلەسووف بووە و زۆر کاریگەریی فەلسەفەی یۆنانی لەسەر بووە و زۆر باوەڕی بە دین نەبووە، بەڵام شیعرەکانی هەلومەرجی شیعری سەرکەوتووی تێدا نییە، جیاوازییەکی تریش هەیە، فەلسەفە سیستەمێک دەخاتە ڕوو، بەڵام بۆ بەیانی دژی ئەو قسەیەی خۆی قسە ناکات، بەڵام شاعیر وا نییە زۆر دوور نەڕۆین موتەنەبی وەسفی

سەیفودەولەی کردووە، بەڵام کە لێی تووڕە بووە جنێوی پێ داوە، وەسفی کافووری، مەلیکی میسری کردووە کە لێی تووڕە بووە، جنێوی بە ئەویش داوە.

## ئەدۆنیس

* تۆ زۆر کاریگەر بوویت بە ئەدۆنیس و زۆر باسی ئەدۆنیسیشت کردووە، دە رۆژێک پێش ئێستا هات بۆ کوردستان و چەند شەوێک لە سلێمانی مایەوە و سەردانی مەزاری شەهیدانی هەڵەبجەی شەهیدیشی کرد، چۆن بوو ئەو سیمینار و شیعر خوێندنەوەی کە لە هۆڵی دیالۆگ بۆی رێک خرا، تۆی لێ نەبووی، هەر هیچ نەبێ سەردانێکیشت نەکرد؟

– ئەگەرچی حەزیش ناکەم بچمە ئەو بازنەیەوە، بەڵام من لە ساڵی ١٩٦٥ یان ١٩٦٦ەوە ئەدۆنیسم خوێندووەتەوە لە رێگەی گۆوارێکی شیعری لبنانییەوە، یان لەسەر شۆستەیەکی شەقامی جمهوریی کەرکووک بوو کڕیم، یان لە دارولکتوبی بەغدا بوو کڕیم نازانم لە کامیان کڕیم، چونکە سەفەرم بۆ ئەو دوو شارە دەکرد بۆ کتێب کڕین، لەو کاتەوە من ئەدۆنیس دەناسم و لە زۆر چاوپێکەوتنیشدا وتوومە، لە ساڵانی سەرەتای تەمەنمدا زۆر سەرسام بووم بەدیوانێکی بەناوی (المسرح والمرايا) و زۆر گرینگ بوو بەلامەوە و زۆر گۆڕانکاریی تێدا کردم، دواتر قەسیدەی (هذا هو إسمي) لە گۆواری شیعر ٦٩ی عێراقیدا بڵاو بووەوە، ئەم قەسیدەیەیان گۆڕانکارییەکی گەورەتری تیا کردم، من یەکەم کوردیشم توانیوومە بە کوردی و عەرەبی لەسەر ئەدۆنیس بنووسم و گفتوگۆ لەسەر سابیت و موتەحەویل و شیعر و بیرورِاکانی ئەدۆنیس بکەم کە لەبارەی شیعر و دین هەیەتی، ئاخر نووسینم لە دوا ژمارەی سەردەمی عەرەبیدا بڵاو کردەوە بەناوی (لطيف هلمت يرد علي ادونيس)، بەڵام من بۆ نەچووم بۆ لای ئەدۆنیس؟ من لە پەراوێزێکی زۆر

بچکۆلەدا بانگ کرابووم و ئەگەر بشچوومایە دەمتوانی گفتوگۆی هەموو دیوانەکانی بە بیروڕاکانیشیەوە لە سابیت و موتەحەویلەوە تا دیوانی (الشعر العربي) بکەم کە سێ بەشە، دەمتوانی بەعەرەبی موناقەشەی چەند سەعاتی لەگەڵ بکەم، نەک وەکو هەندێ برادەری خۆمان کە رەنگە هەڵقوون هەڵقونیشیان کردبێ، بۆ ئەوەی بچنە هۆڵەکەوە و ئەدۆنیس ببینن، بەڵام نەشیانتوانیوە بە عەرەبی قسە بکەن، بەڵام بەداخەوە حەزم دەکرد بانگهێشتێکی گەرمم بکەن و بچم ئەدۆنیس ببینم، چونکە لەوانەی کە لە مەجلیسەکەی ئەدۆنیسدا بوون، کەسیان پێش من ئەدۆنیسیان نەناسیوە و کەسیش پێش من باسی ئەدۆنیسی نەکردووە، رەنگە لە دوای راپەڕینەوە، هەندێ کەس شیعری ئەدۆنیسی خوێندبێتەوە و ناوی بیستبێ.

## بڵاوکردنەوەی شیعر

* یەکەم شیعرت لە ساڵی ١٩٦٣دا نووسیوە، بەڵام، یەکەم دەقت لە ساڵی ١٩٦٩دا بڵاو کردووەتەوە لە کۆواری رزگاری، بۆچی دوای شەش ساڵ لە نووسینی شیعر ئینجا بەرهەمێکت بڵاو کردووەتەوە؟

– بۆچی وا دەزانی ئەوساش وەکو ئێستا لە سەری هەموو کۆڵانێکدا کۆوار و رۆژنامەیەک هەبوو، بەرهەمی تێدا بڵاو بکەیتەوە؟ ئێمە لەو گەرمیانە کە بای کوێستانیشی بۆ نەدەهات گەمارۆ درابووین بە عەرەب و تورکمان و رەگەزپەرستی و زمانمان لێ قەدەخە کرا بوو، ئێمە کە جلێکی کوردیمان دەکردە بەر بەتەحەداوە لەبەرمان دەکرد کە ئێمە کوردین بۆیە جلی کوردی لەبەر دەکەین، جلی کوردی لەبەرکردن لەو سەردەمەدا وەکو ئەوە وابوو کە چەک هەڵگری و بچیتە شاخ دژی رێژیمی ئەو کاتە، جا لەبەر ئەوە من یەکەم شیعرم بۆ پۆلە شەهیدێکی پێشمەرگەی قارەمان نووسی کە لە ریزە چیای قاتەکانی کفری شەهید کران، بیست و هەشت پێشمەرگە بوون، کەوتنە کەمینی دوژمنەوە و شەڕی دەستەویەخەیان کردبوو و تەنانەت گەشتبووە،

شەرە خەنجەر، لەناو کفریدا تەرمی هەندێکیانیان بە ئۆتۆمۆبێل راکێشا، ئەو شیعرەش شیعرێکی سادە و ساکاربوو من منداڵێک بووم، هیچ شوێنێک نەبوو شیعری تێدا بڵاو بکەینەوە، بۆ خۆمان دەمانووسی، دواتر لە بەرنامەکانی ئێستگەی کوردیی بەغداوە شیعرەکانمان بڵاو دەکردەوە، منیش و چەند هاوڕێیەکم بەتایبەتی فەرهاد شاکەلی.

* ئەی یەکەم شیعرەت بەچ ناوونیشانێک بڵاو کردەوە؟

– وەڵاهی وەکو ناو بیرم نەماوە، بەس وا بزانم لە ژمارە ٩ی کۆواری رزگاری بڵاو بووەوە کە لە سلێمانی دەردەچوو، هەم دەقێکی شیعری بوو، هەم بانگەوازێک بوو کە ئیتر کۆتایی بە شیعری کۆن بێت و بەشێوازێکی نوێ بنووسین.

* کاتێک کە شیعر دەنووسی ئەو فیکرەی کە دەتەوێ بیگەیەنی، بۆی دادەنیشی وشەکان رێک دەخەیت یان یەکسەر لەگەڵ بۆ هاتندا دای دەڕێژی بە رەشنووس دەینووسی و دوایی پاکنووسی دەکەیت؟

– هەر لە منداڵییەوە بیستبووم هەور کە نێزیک بوو بارانی هەیە، خوا ئاگەدارە پاریش و ئەمساڵیش پێش ئەم بارانانە هەور لووتی دەژەندە ناو حەوشەکە و گسکی لە حەوشەکە دەدا و باران نەدەباری، کەچی ئێستا هەور دەبینم، چوار کیلۆ مەتر لە گۆیژە بەرزترە و باران دەبارێت، ئەمە چ نهێنییەکە نازانم، بەخوا منیش نازانم کە شیعر دەنووسم بیر لە هیچ شتێک ناکەمەوە، ئەوەندە دەزانم چۆن باران دەبارێ ئاوا شیعر دەڕژێتە سەر کاغەزەکەم، بەڵام دواتر پێیدا دەچمەوە، وەکو چۆن باخەوانێک بیەوێت ئاو بچێتە سەر باخەکەی ئاودێری دەکات و گژوگیایەکی بێ کەڵک هەڵدەکەنێ بۆ ئەوەی ئاوەکە نەدزن، منیش ئاوا دەکەم و گوڵبژێرێک دەکەم و گژوگیاکانی لێ دەردەهێنم و شیعرە رەسەنەکە دەمێنێتەوە و ماکیاج و کۆلاجێکی دەکەم، چونکە شیعر زۆرجار بێ

ماکیاج و کۆلاج شیعرێکی سەرکەوتوو نابێت.

* ناوەڕۆکی شیعر پێوەندییەکی راستەوخۆی هەیە بەبیر و فیکری شاعیرەوە؟

- سەیرە! میوەی ترش و شیرین یەک ئاو دەخۆنەوە و لە یەک خاکیشدا دەڕوێن، لەبەرئەوە شاعیر هەیە زۆر ناسراوە بە شیعری عاشقانە، بەلام شیعری نیشتمانی و هەجووش دەڵێ و شیعر بۆ منداڵیش دەڵێ، ناتوانین دیاریی بکەین، بەلام رەنگە هەر شاعیرە و لە بوارێکدا سەرکەوتوو بێت، هەشە لە هەموو جۆرەکانی شیعردا سەرکەوتووە، گۆران لە شیعری ژندا لە شیعری عاشقانەدا زۆر سەرکەوتووە، بەلام نەیتوانیوە یەک دێر بۆ کۆماری مهاباد (کوردستان) بنووسێ، هەرچەندە هاوچەرخی دروستبوون و رووخانی کۆماری مهابادیش بووە.

* کاتێ خەیاڵی شاعیر سنووری نابێت، شیعر خۆی چوارچێوە بۆ خۆی دیاری دەکات؟

- هەر شیعرێک شاعیر چوارچێوەی بۆ دیاری بکا، شیعرێکی سەقەت و پەککەوتە دەردەچێ، بەلام ئەگەر شیعرەکە خۆی چوارچێوەی بۆ خۆی دیاری کرد وەکو ئەوە وایە لە بارانەوە رووبارێک دروست ببێت و رووبارەکە خۆی دەزانێ بە کوێدا دەڕوات و بە کوێدا ناڕوات، بەلام ئەگەر ئێمە بمانەوێت بە ئارەزووی ئێمە ئەو رووبارە بڕوات هەرگیز نابێت بە رووبار، شیعریش بە قسەی کەس ناکات تەنیا بە قسەی خۆی نەبێ.

## پەخشانە شیعر

* پەخشانە شیعر چییە؟

- ئەو پەخشانە شیعرییەی کە شیعرێتی تێدایە، شیعرە و زۆرجار بە لای

منەوە لە شیعری کێش و سەرواداریش شیعرترە، لە راستیشدا شتێک نییە ناوی پەخشانە شیعر بێت ئەمە هەندێک شاعیری کورد لە بیرێکی تەسکەوە کاتێ کە شتێک دەنووسن سەروای نییە، ناوی دەنێن پەخشانە شیعر، هەندێ شاعیری ناوداریشن، ناوێرن بڵێن شیعر، یان بیر تەسکن و ئەو جۆرە شیعرە بە شیعر نازانن، بەڵام کە ئەدگار ئالان پۆ و بۆدلێر و رامبۆ ، کاتێک ئەو گەورە شاعیرانە، ئەم جۆرە شیعرەیان بە شیعر دانا بێت، ئێمە بۆچی بە شیعری دانەنێین؟ کاتێک تەورات جۆرێ بێت لە جۆرەکانی شیعری نوێ و هەندێک دەقی ئینجیل جۆرێک بێت لە شیعری نوێ (بەبۆچوونی خۆم دەڵێم) ئیتر ئەگەر شیعرێکی بێ کێش و سەروا پێی بڵێین، شیعر چ گوناهێکە؟ گوناه ئەوەیە کێش و سەروا بکەین بە هەلومەرجی سەرەکیی شیعر.

* لە دەقی کراوەدا شاعیر زیاتر سەربەستە لە دەربڕینی هەر پەیامێک کە بیەوێت، لەبەرئەوەیە تۆ زیاتر گرینگی بە دەقی کراوە دەدەیت؟

– نەمویست من خۆم بچمە ئەو باسەوە، چونکە نامەوێت هەمووی خۆم باسی بکەم، یەکەم دەقی کراوە لە شیعری کوردیدا، من نووسیوومە لە ساڵی ١٩٧٠دا لە دیوانی (خوا و شارە بچکۆلەکەم)دا بڵاو بووەتەوە، پێشتریش لە ئێستگەی کوردی دەنگی بەغداوە لە بەرنامەکانی کاک جەلالی میرزا کەریم و کاک عەبدوڵا عەباسدا بڵاو بووەتەوە، کە کاک جەلالی میرزا کەریم بەرنامەی شیعر و مۆسیقای هەبوو کاک عەبدوڵا عەباسیش بەرنامەی ئێوارەتان باشی هەبوو، دەیان شیعری کراوەم لەو دوو بەرنامەیەدا بڵاو کردەوە، وەکو شیعری (ئەم کولەکانە دەشکێنم، لە باوەڵێکی کلیل ونبوودا، چوار هەڵبەست لە رۆژژمێری رێبوارێکی ماندوودا) ئەمانە هەمووی دەقی کراوە بوون لە ساڵانی ١٩٦٨ و ١٩٦٩دا لەو بەرنامانەوە بڵاو بووەتەوە، لە ساڵی حەفتاشدا لە خوا و شارەبچکۆلەکەم دا گەلێ دەقی کراوەم بڵاو بووەوە، ئێستاش درێژترین دەقی کراوە هی منە، شیعری (دژی گوێ بەرەو ئەو) ساڵی ٢٠٠١ لە بەرگی دووی

دیوانی لەتیف هەڵمەتدا، بڵاوم کردەوە کە بەتەنیا ئەو دەقە سەد لاپەڕەی گرتووەتەوە.

* واتە تەنیا لەبەر سەربەستیی شاعیرە لە دەقی کراوەدا زۆرجار پەنا دەبەیتە بەر ئەو جۆرە دەقە؟

- بە راستی دەقی کراوە مەودایەکی ڕەهای هەیە، بۆ ئەوەی شاعیر بتوانێ هەموو شتەکانی تێدا بخاتە ڕوو و هەموو بیناکانی خۆی تیا دروست بکا، بەڵام دەقی کێش و سەروادار وەکو سنوورەکانی ئەم وڵاتانە بە یاسا تەنراوە و ناتوانی بەبێ پاسپۆرت بیبڕیت.

## ونبوون

* باسی ئەو کۆمەڵە شیعرەت کرد لە رۆژمێری ڕێبوارێکی ماندوودا لەگەڵ چەند وشەیەک لە خۆڵەمێش، ئەو دوو کۆمەڵە شیعرەت زۆری ون بوو؟

- کاتی خۆی ساڵی حەفتا و چوار کە چووین بۆ شاخ، هەموو دیوانەکانی خۆم لەگەڵ خۆمدا برد و لەوێش رۆژانە شیعرم دەنووسی، وەکو بیرم بێت چوار دەفتەری سەد پەڕەیی و شەست پەڕەیم پێ بوو، ئەو کاتە سەرەتای گەنجیم بوو، شەوانە لە شاخ دادەنیشتین، شیعرەکانم دەخوێندەوە، رۆژێک میوانمان هات لە دوورەوە حەزم کرد شیعرەکانم بخوێنمەوە، چووم دەفتەرەکانم بێنم سەیرم کرد نەماون، زۆر گەڕام لە چوار دەفتەرەکە دووانی مابوو، وەکو ئاگەدارییەک لە دەنگی پێشمەرگەدا وابزانم لە دەنگی کوردستانەوە بوو دوو ئاگەداریم بۆ کرد کە دوو دەفتەر بەم ناوونیشانانە ون بووە کێ دۆزیویەتەوە بۆم بگێڕێتەوە، بەڵام من دەمزانی نادۆزرێتەوە، چونکە تۆزێ ناکۆکیم بووبوو لەگەڵ برادەرێکدا رەنگە لەوپەڕی تووڕەییدا هیچ دەسەڵاتێکی تری نەبووبێ ئەوە نەبێ ئەو زەبرەم لێ بدا، وا بزانم خستبوویە

ئاوەکەی چۆمانەوە، چونکە بن بەرد نەما بۆی نەگەڕێم ئەو سەردەمە ئێمە لە رایات بووین، بن بەردی رایات نەما بۆی نەگەڕێم، نەمدۆزییەوە کە سەیری ئاوەکەی رایاتم دەکرد وام دەزانی هەمووی مەرەکەبی شیعرەکانی منە، گەردنی ئازاد بێت، ناوی نابەم شاعیر نەبوو، برادەرێکی رۆشنبیر بوو، وا بزانم ئێستاش ماوە جاربەجار ناوی دەبیستم، هیچ شتێکم نییە لە دڵدا بەرامبەری، چونکە من توانیم ئەو قۆناخە شیعرییانە تێ پەڕێنم و قۆناخی بەرزتر بێنمە کایەوە و داهێنانی زیاتر بکەم، رەنگە ئەگەر ئەو دوو دەفتەرەی نەخستایەتە ناو ئاوەکەوە بەو دوو دەفتەرە قەناعەتم بکردایە، ئەگەرچی شتێکی نامرۆڤانە بوو، بەڵام لەوەیە لە تووڕەییدا کردبێتی، بەهەرحاڵ گلەییم لێی نییە.

## ناوبانگ

* شاعیرێتی، بێجگە لە ناوبانگ، چی پێ داویت؟

– بێ کاتیی پێ داوم، خوا ئاگەدارە، بە گەنجیش بوارم نەبووە دڵداری بکەم هەر خەریکی کتێب کڕین و کتێب خوێندنەوە و دەفتەر و قەڵم کڕین و خەریکی نووسینی شیعر بووم، لەگەڵ دوو برادەریشدا بچوومایەتە دەرەوە، ئیتر موناقەشەی شیعری بوو، لەبەرئەوە، من بەگەنجی دڵداریم نەکرد، لە دوای گەنجی کردم و ئێستاش خۆم بەبەختەوەر دەزانم، کە عاشقێکی گەورەی سەدەی بیست و یەکم.

* توانیوتە ببی بە شاعیرێک کە سنووری وڵاتەکەت ببڕیت و لە دەرەوە بناسرێیت؟

– کاتێک کە شیعرم کرابێت بە عەرەبی و فرەنسی و فارسی و شیعرم لە کۆواری لیبی و سعوودی و سووریدا بڵاو بووبێتەوە و وەرگێڕرابێت بۆ سەر زمانی سویدی و هۆڵندی و ئەڵمانی و لە ئەمەریکا چیرۆکی منداڵانم، وەکو

فەرهاد شاکەلی نوسخەکەی بۆ ناردم کرا بێت بە ئینگلیزییەکی ئەمەریکی و کرا بێت بە تورکی و برادەرانی کوردی باکور بەپیتی لاتینی کوردی چاپیان کردووە بۆ ئەوەی کوردانی باکور بیخوێننەوە، کەواتە شیعرم سنوورەکانی بڕیوە و گەیشتووەتە جێگە دوورەکان، کەسانێک کە سەری خۆیان هەڵدەگرن و دەچن بۆ سوێد و دەڵێن لە مەنفاین شیعری من گەیشتووەتە ئەو شوێنانە، دەیان شیعریشم کراوە بە ئینگلیزی، ئەو کەسانەی بەشدارییان کردووە لە وەرگێڕانی شیعرەکانم بۆ زمانەکانی تر (کەمال غەمبار، عەبدوڵا تاهیر بەرزنجی و سەلاح بەرواری، بەهرۆزی کورد ئەحمەدی لە زانکۆیەکی ستۆکهۆڵم دەرس دەڵێتەوە، ئەمەل جبووری، کردوویەتی بە ئەڵمانی، فەرهاد شاکەلی و کۆمەڵێ مامۆستای سوێدی کردوویانن بەسوێدی، د. هەڵکەوت مەلا حەکیم و د. هاژە کلاوێ کە ژنێکی فرەنسییە، کردوویانە بە فرەنسی و ئامانج شاکەلی و قەشە پاوڵدیغرێف کردوویانە بە هۆڵندی و سەدان شیعریشم کراوە بە عەرەبی و سەدانی تریشم کراون بە فارسی هەروەها بە تورکیش.

## وەرگێڕان

* کاتێ کە شیعرێکت وەردەگێڕرێت بۆ هەر زمانێک، دیارە وەرگێڕانی شیعر لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر قورسترە لە وەرگێڕانی هەر بابەتێکی تر، چونکە شیعر دەبێ ئەو تام و چێژەی خۆی تێدا بمێنێتەوە، قەت بووە کەسێک شیعرێکت وەربگێڕێت و جوانیی شیعرەکەتی کوشتبێت و غەدری لێ کردبێت؟

– رەنگە هەموو ئەو شیعرانەم کە وەرگێڕاون، بۆ سەر زمانەکانی تر وەرگێڕانی هەموویانم بەدڵ نەبێت، بەڵام هەرچۆنێک بێت شتێکی باش بووە، چونکە بەهۆی ئەو وەرگێڕانانەوە گەلێ دیراسە و لێکۆڵینەوەی باش لەسەر شیعرەکانم نووسراون، ئەوەی ئاگەداربم بە فارسی و عەرەبی، بۆ نموونە سەید عەلی ساڵحی کە رەخنەگرێکی گەورەیە، بیر و بۆچوونی زۆر باشی

هەیە لەسەر شیعرەکانم، ئەمەش لە ڕێگەی وەرگێڕانەوە بووە، ڕەخنەگرێکی گەورەی عەرەب حاتەم سوگەر سێ دیراسەی زۆر جوانی لەسەر شیعرەکانم هەیە شیعرەکانمی لە ئاستی ئەو شیعرانە داناوە کە ت. س ئەلیۆتی ئینگلیزی هەلومەرجی شاعیرێتی بۆ دائەنێ و شیعرەکانمی خستووەتە پاڵ شیعرەکانی لۆرکا و بایرۆن و ئەراگۆن و نازم حیکمەتەوە، هەروەها ئەمە بۆچوونی سەید عەلی سالْحیشە، جگە لەوەش گەلێ نووسەری تری عەرەب دیراسەیان لەسەر شیعرەکانم کردووە، لەوانە حەسەن نەواب و زاهیر جیزانی و ئیسماعیل عیسا، هیچ شیعرێکم نییە، بینێری بۆ کۆوارێکی عەرەبی و بڵاو نەبێتەوە.

## بەرهەم و کتێب

* کۆمەڵێ نووسین و بابەتی خۆت کۆ کردووەتەوە و لە کتێبێکدا بڵاوت کردووەتەوە، بەناوی (شیعر، خەنافس، تەنوورەی مینیجۆپ) ئەم ناوە بۆچی؟

- کاتێ من هەرزەکار بووم و سەرەتای شیعرنووسینم بوو، شیعری نوێی و خەنافس و تەنوورەی مینیجۆپ باو بوو، ڕێژیمی ئەو سەردەمە دژی شیعری نوێ بوو و بایەخیان پێ نەدەدا، تەنانەت ئەوانەی کە لە ڕۆژنامە و کۆوارەکاندا بوون، بەیت و بالۆرەی گاڵتەجارییان بە شاعیرە نوێخوازەکانەوە هەڵدەبەست، ئەوەشی قژی درێژ بکردایەتەوە واتە خەنافیسی بووایە، ئۆتۆمۆبێلی تایبەتی هەبوو، دەیانخستە ناو ئەو ئۆتۆمۆبێلانەوە و دەیانبردن و بۆ ئۆردووگای تایبەتی دووری شار، چل بۆ پەنجا ڕۆژ دەیانهێشتنەوە و زەوییان پێ هەڵدەکەندن و بلۆکیان پێ دەبڕینەوە و کاری بێگاریان پێ دەکردن، هەر ژنێکیش تەنوورەی مینیجۆپی لە بەر بکردایە (تەنوورەی مینیجۆپ لە سەرووی ئەژنۆوە بوو) ئەوا پۆلیسی داوونەریت هەبوو بە قوتویەک بۆیاخەوە لە زۆر ڕێگەدا وەستابوو، لاقی ئەو ئافرەتانەیان بۆیە دەکرد کە ئەو تەنوورەیەی لە بەردا بوو، ئافرەتەکەش ناچار دەبوو بڕواتەوە بۆ ماڵەوە و جلەکانی بگۆڕێ،

واتە ڕێژیم لەو سەردەمەدا دژی شیعری نوێ و دژی خەنافس و دژی تەنوورەی مینیجۆپ بووە، سەیر ئەوەیە هەموو ڕێژیمەکان لەو سەردەمەدا دژی ئەو حاڵەتە بوون، بەڵام هەموویان لەناوچوون و شیعری نوێ و خەنافس و تەنوورەی مینیجۆپیش سەرکەوت، ئەمە سەرکەوتنێکی سیاسی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی بوو، سەرکەوتنی ئافرەتیش بوو بەسەر ڕێژیمی پیاوسالاریدا، من ناڵێم باوکسالاری، یان براسالاری، دەڵێم ڕێژیمی پیاوسالاری، چونکە پیاو باڵادەست بوو.

* (ئەو هۆنراوەیەی تەواو ئەبێ و تەواو نابێ) پێشەکیت بۆ نەنووسیوە، هەروەها کۆمەڵە هۆنراوەی (وشەی جوان گوڵە گوڵ) بە شیعرێک دەست پێ دەکات کە داوا لە دایکان و باوکان دەکات خۆشەویستیی نیشتمان فێری منداڵەکانیان بکەن، ئەو شیعرەت وەکو پێشەکی داناوە؟

– ئەو شیعرە وەکو پێشەکییەک نییە، دەتوانین بڵێین ئەو قسانە وەکو شیعرێکە، واتە ناخرێتە بواری پێشەکییەوە، شیعرێکی بچووکە و کۆمەڵێ قسەیە شیعرییەتی تێدایە، دایکەکان /دەستەکانتان ماچ دەکەم/ منداڵەکانتان فێری خۆشەویستیی نیشتمان بکەن، من هەرگیز حەزم لە پێشەکی نییە، دەبێ شیعرەکە خۆی خۆی فەرز بکا، دەبێ دەقەکە خۆی خۆی فەرز بکا، داستانی گەلگامیش پێشەکیی بۆ نەنووسراوە و چوار هەزار و ئەوەندە ساڵە ماوەتەوە، دەقی باش، پێشەکیی ناوێ، ئەو دەقانە پێشەکییان دەوێت کە لێیان بەگومانی ئاخۆ دەقێکی سەرکەوتووە، یان نا؟ مەبەستیشم ئەوە نییە، هەر دەقێک پێشەکیی بۆ نووسرا، ئیتر گومانی ئەوەمان هەبێ ئاخۆ سەرکەوتووە، یان نا، بەڵام جوانترین شت ئەوەیە، دەق خۆی خۆی پێشکێش بکا، من و جەنابت چووینە شوێنێک ئەگەر تۆ فەیلەسووفیش بیت، من نەڵێم ئەمە فەیلەسووفێکە وایە و وایە و... هتد ئەگەر جەنابت قسەت کرد با قسەکانت بیسەلمێنێ تۆ فەیلەسووفیت و خەڵک لە ڕێگەی قسەکانی خۆتەوە

بتناسن، نەک لە ڕێگەی وەسف و ستایشەکەی منەوە.

* لە دوای ڕاپەڕینەوە تا ساڵی دوو هەزار، هیچ شیعرێکت بڵاو نەکردەوە، هۆی چی بوو لە ماوەی ئەو هەشت ساڵەدا، بێدەنگ بوویت و شیعرت بڵاو نەکردەوە؟

- هۆکارەکەی ئەوە بوو، جارێکیان لە بنکەی ڕووناکبیریی کەرکووک وا بزانم، ئەو کاتە کاک جەلیل زەنگەنەی هونەرمەند و دەرهێنەر، لێپرسراوی بنکەکە بوو، لەگەڵ کاک عەلی کەریم و کاک جیهاد دڵپاک و ئەوان، کۆڕێکیان بۆ کۆمەڵێ شاعیر ساز کرد، کە شوێنی ئێستای یانەی فەرمانبەران دەکات بەرامبەر بە پارێزگای سلێمانی، نێزیکەی دە بۆ دوازدە شاعیر بووین. بەڕاستی هەستم کرد کە شیعرەکان، هەمووی لەیەک دەچێ، هەروەها هەستم بەوەش کرد ئەو شیعرەی کە خۆشم خوێندمەوە لە شیعری جارانم دەچوو، هەرچەندە پێشتریش هەستم کردبوو، کە لە هەندێ شیعردا خۆم دووبارە دەکەمەوە، ئەو کۆڕە ساڵی ١٩٩٢ بوو هەر لەوێ بڕیارم دا، تاکو ساڵی دووهەزار، شیعر بڵاو نەکەمەوە، بۆ خۆم دەمنووسی، بەڵام بڵاوم نەدەکردەوە، ساڵی دووهەزار یەکەم کۆڕم بۆ ئەو شیعرانەی کە لەو ماوەیەدا نووسیبووم، من ساز کرد کە بڵاوم نەکردبوونەوە لە هۆڵی هونەرمەندان لە سلێمانی، زۆر سوپاسی کاک زۆراب دەکەم کە ئەو کات ئەندامی دەستەی نووسەرانی کۆواری گەلاوێژی نوێ بوو لە سوێد، گەڕابووە و ئێستاش لە سویدە، بەڕاستی ئەو و برادەرانی هۆڵی هونەرمەندان و کۆواری گەلاوێژی نوێ زۆر ماندوو بوون بۆ سازدانی ئەو کۆڕە، لەو کۆڕەدا قەسیدەیەکی درێژی سەد لاپەڕەییم خوێندەوە (دژی گوێ بەرەو ئەو) دواتریش لە دووهەزار و یەکدا بە دوو بەرگ، ئەو شیعرانەم چاپ کرد.

* لە شیعرێکتدا چەندان وشەی دژ بەیەکت باس کردووە، وەکو فڕۆکەخانەی کەر- تەویلەی فڕۆکە، نوێژی شەیتان- گوناهی

دەروێش و.. هتد. مەبەستت چییە لەو جۆرە شیعر نووسینە؟

– ئەوە لەوێدا زیاتر لادانی زمانەوانییە، واتە لادانی زمانەوانیم پێڕەو کردووە، جگە لەوەش کاتی خۆی سوریالیزمەکان و دادایزمەکان هەندێ دەقی سەیریان نووسیوە، رۆژنامەیەکیان وشە وشە کردووە وەکو بلێین نێزیکەی پێنجسەد، یان هەزار وشەیان بەمەقەست لە رۆژنامەیەک لێ کردووەتەوە و لەسەر مێزێک ریزیان کردووە و بە لەزگە لێکیان داوە و شیعرێکیان لێ دروست کردووە، من نەمویستووە لاسایی ئەوان بکەمەوە، بەڵام ویستوومە دەقێکی سوریالیزمانە و دادایزمانە بە کوردی بنووسم، بەو شێوەیەی خۆم، نەک بەشێوەی فۆتۆکاری، گەلێ شاعیرانی هاوچەرخم و هاوتەمەنم و گەلێ شاعیرانی ئێستاش لاسایی کوێرانەی دادایزم و سوریالیزم دەکەنەوە و کارێکی فۆتۆکۆپیی ئەوان دەکەن، ئەوەی من دەقێکی خۆماڵییە نەک لاسایی، لە هەمان کاتیشدا دەقێکی سوریالی و دادییە و لادانی زمانی زۆر تێدایە.

* لە شیعرێکی تردا دەڵێی، ئاسمان و بەرد گیانیان هەیە، یان دەڵێی، پێڵاو زمانی هەیە، چۆن گیانت بەخشی بە ئاسمان و بەرد و زمان بە پێلاو؟

– کە باسی لادانی زمان لە شیعردا دەکرێت، ئەم جۆرە دەقانەیە کە لادانی زمانی تێدایە، من هەوڵم داوە لەو دوو شیعرە و دەیان شیعری تری لەم جۆرەدا کارێک بکەم کە لە شیعری نوێی کوردیدا تازە سەری هەڵداوە و کەم هەیە و پێشتر خۆم زۆر بەکارم هێناوە لە: خوا و شارە بچکۆلەکەماندا، لە ئامادەبوون بۆ لەدایکبوونێکی تردا، لە گەردەلوولی سپیدا، لە وشەی جوان گوڵە گوڵەدا، لە سروودی هەژاراندا و لێرەشدا هەوڵم داوە ئەو لادانە زمانییە لە هەندێ دەقدا بچەسپێنم، وەکو پێشتریش باسم کرد نابێ بەجۆرە دەقێکەوە بلکێین، چونکە بە بۆچوونی من، شیعر خەتێکی راست نییە لە سەرەوە تا خوارەوە، بگرە دەبێ هەندێ نوێگەری و چڵ و پۆپی بۆ بکەین، یەکێ لەو شتە گرینگانە ئەوەیە لادانی زمانی لە دەقە شیعرییەکانماندا بچەسپێنین کە ئەمە

له شیعری جیهانیدا سالآنێکی زۆره چەسپاوه، تەنانەت من له چیرۆک و شیعری منداڵانیشدا کاری وام کردووه، گیانم بەخشیوه بەشته بێ گیانەکان، یان زمانم بەخشیوه به ئاژەڵ، هەر بۆ نموونه، چیرۆکێکی منداڵانم هەیه بووکەشووشەیەکه له ماڵی کیژێکی قوتابیدایه که بەیانیان له خەو هەڵدەستێ سەیر دەکات جلەکانی ئوتوو کراوه و ژوورەکەی پاک کراوەتەوه و کتێبەکانی ئامادە کراوه و خراوەته بەردەست بۆ ئەوەی بیبات بۆ قوتابخانه، لێرەدا من وام کردووه که ئەو بووکەشووشەیه شەوان دێته خوارەوه، له شوێنەکەی خۆی ئەو کارانه بۆ کیژه قوتابییه بچکۆلانەکە دەکات، من ئەم جۆره بەکارهێنانەی زمان چ له شیعر و چ له چیرۆک و شیعری منداڵانیشدا بەکارم هێناوه، پێش من جاحز له کتێبی حەیوان و هەندێ بەرهەمی تردا..له زمانی ئاژەڵەوە قسەی کردووه، هەروەها له کتێبی کلیله (ودمنه)شدا ئاژەڵان و شته بێگیانەکان قسه دەکەن، بەڵام من بەشێوەیەکی تر زمان دەبەخشم به شته بێگانەکان، لەو کتێبانەشدا بۆ مەبەست و بەشێوەیەکی تر زمان دەبەخشرێ به ئاژەڵ و بێ گیانەکان، پێڵاو خۆی زمانیشی هەیه، ئێستا وای لێ هاتووه تۆزێ زمانی کورته، بەڵام جاران پێڵاو وا دروست دەکرا له ناوەوه زمانەیەکی درێژی هەبوو، هەموو سەری پێی دەگرتەوه هەر پێشیان دەوت زمانەی پێڵاو، منیش له شیعردا تەوزیفم کردووه لەلایەکی ترەوه، جگه لەلادانی زمانی پێوەندی بەو جۆره پێڵاوەی جارانیشەوه هەیه که زمانی هەبوو.

* له شیعری ئەم کولەکانه ئەشکێنم، له شوێنێکدا دەڵێی:
پەرستگاکان دەڕووخێنم، بۆ ئەو کاته وتنی شتێکی وا ئاسان نەبووه، چونکه له کۆمەڵگەیەکی ئاینیدا پیرۆزیی پەرستگا، یان مزگەوت، رێگه بەو قسه نادات.

– به بۆچوونی من ئاینی پیرۆزی ئیسلام کاتێک هات ئیلغای جێگەی کرد بۆ خواپەرستی و هەموو گەردوونی کرد به جێگەیەک که خوای تێدا بپەرستڕێت، خوا بت نییه له پەرستگایەکدا بیپەرستی، خوا له هەموو شوێنێکدا هەیه،

لەبەرئەوە، لە هەر شوێنێکدا روو لە خوا دەکەی دەتوانی خوای خۆت بپەرستی ئەمە لەلایەک، لەلایەکی ترەوە، ئەو پەرستگایە تەنیا پەرستگا ئاینەکان ناگرێتەوە، پەرستگا سیاسییەکانیش دەگرێتەوە، لە هەندێ وڵاتدا سیاسەتمەدار و سیاسەتکار دەپەرسترێن، ئەمە کارێکی خراپە بۆ نموونە: لە وڵاتێکی وەکو چیندا بە زۆرەملێ وایان لە خەڵک کرد بوو ماوتسی تۆنگیان ئەوەندە خۆش بوێت، بیپەرستن، ستالین بەزەبروزەنگ وای لە خەڵکی کردبوو ناچار بووبوون جۆرە خۆشەویستییەکی وای بۆ دەرببڕن لە ئاستی پەرستندا بێت کە لە ناخیشەوە خۆشیان نەدەویست، پەرستگاکان دەڕووخێنم پەرستگا سیاسییەکان و پەرستگا کۆمەڵایەتییەکان و پەرستگا ئابوورییەکان و پەرستگا رۆشنبیرییەکانیشە، ناکرێ لە وڵاتێکدا یەک رۆماننووس هەبێت و یەک شاعیر هەبێ و یەک نووسەر هەبێ و یەک سیاسەتمەدار هەبێ، بگرە دەبێ رێگە بدرێ، دەیان قوتابخانەی رۆشنبیری هەبێ و دەیان دەنگی شیعری هەبێ و دەیان رۆماننووسی سەرکەوتوو هەبێ و دەیان چەپکەگوڵ.

من ساڵی ١٩٦٩ دوای خوێندنەوەی هۆنراوەی (هذا هو إسمي)ی ئەدۆنیس چامەیەکم نووسی و کاریگەریی ئەوەم لەسەرە، نامەوێ لێرەدا لێی پەشیمان ببمەوە، چونکە لە دوو چاوپێکەوتنی تردا وتوومە، بەڵام کاریگەرییەکی فۆتۆگرافی نا، بگرە کاریگەرییەکی وا کە منیش دەقێکی وام نووسیوە، چۆن دەڵێن، هەموو دەقێک زادەی دەقێکی ترە، ئەمەش زادەی دەقەکانی پێش خۆیەتی زیاتر ئەو دەقەی ئەدۆنیس، بەڵام دەقێکە خەسڵەتی تایبەتی من و دەقەکە خۆی تێدایە، لەبەرئەوە من لەم دەقەدا وەکو دەق هەموو دەقەکانی خۆمم تێک شکاندووە، کە دەڵێم پەرستگاکان دەڕووخێنم، ئەوە بەواتایەکی دەرەکی، بە واتایەکی ناوەکییش هەموو جۆرە پەرستگاکان پەرستگا ئاینی و رۆشنبیری و سیاسییەکان دەبێ، وێران بکرێن و بڕووخێنرێن، چونکە هەموو شوێنێکی گەردوون بۆ خواپەرستی لەبارە و دەشێ، نەک هەر مزگەوت، •هەروەها دەنگی شیعری و دەنگی رۆماننوس و... هتد زۆرە لە هەموو میللەتێکدا با کەس بانگەشە بۆ تاکە کەس نەکات، بە ئاشکرا دەیڵێم جاران

برادەرانی مـارکسـی دەیانـوت گـۆران تەجـاوز نـاکـرێ، کـە گـوایە برادەرانی مـارکسـی خـۆیان بەوە دادەنێن ژیان بەرەو پێـشـەوە دەڕوات و باسـی زۆر شت دەکەن، بەڵام کـە دەهاتە سـەر گـۆران، دەیانـوت گۆران تەجاوز ناکرێت و کۆتا ترۆپکی شیعری کوردییە، منیش دەڵێم گۆران لە حەفتاکانەوە تەجاوز کراوە و وەکو لووتکەیەکی گەورەی شـیـعری کـوردی مـاوەتەوە، بەڵام لە پاڵ ئـەویشـدا دەیان لووتکەی گەورە و گەورەتریش دروست بووە.

* شیـعرێکت هـەیە، لێـی پەشیمـان بیت و حەز بکەیت لە دیـوانەکەت دەری بێنیت؟

– نەخێر هیچ شیـعرێکم نـییە لێـی پەشیمـان بم، هەرچی شیـعرم هـەیە، ئـەگەر شـیـعری عـاشـقـانە بێت ئەو کـەسـانەی ئـەو شـیـعرە عـاشـقـانانەم بۆ وتوون تا ئێسـتـاش شـایسـتـەی ئەو شـیـعرانـەن، ئەگـەر شـیـعـری نیشـتـمـانـی بێت بۆ کوردسـتـانم وتووە و کوردسـتـان شـایسـتـەی ئەوەیە نەک بەمەرەکەب شـیعری بۆ بنووسم، بگرە شایستەی ئەوەیە بەخوێنم شیعری بۆ بنووسم، کۆمـەڵێ شیعرم نووسیوە بۆ ئەو شاعیرانەی کۆچی دواییـیان کردووە و نیشتمانپەروەر بوون و دەقـانگیریم لـەگـەڵ دەقـەکـانیـاندا کـردووە، ئەوانەش شـاکـاری شـیـعـری مـن و شـانازییـان پێوە دەکـەم، شـیـعـرم بۆ هـیچ بۆنـە و کـەسـایـەتـیـیـەک نـەوتووە، لێی پەشیمـان بم، لەبەرئەوە ئامادەم، هەموو شیعرەکانم بخـەمـە نـاو دیوانەکانمەوە و چاپیان بکەم.

* خـۆت بە شـاعـیـری چ چینێـکی خـەڵک دەزانیت؟ وەکو دەڵێن فـلان شـاعیر شاعیری چینی چەوساوە و زەحمەتکێشە.

– بە بۆچوونی من شـاعـیـر چین و مـینی نـیـیـە، بەڕاسـتـی ئـەمـە پۆلاندنێکی هـەڵەیە، شـاعـیـر لە هەمـوو ئان و زەمـانێکدا، دەتوانـێ لەناو هەمـوو چینەکـاندا ڕۆڵی خـۆی ببـینێت، کـاری شـیـعـر زیاتر جـوانکارییـە و باسـکردنی شـتـە گـەورەکـانی گـەردوونـە، وەکو مـەرگ و ژیان و دۆزینەوەی شـتی نوێ کە کـەسی

ئاسایی نایدۆزێتەوە، ئەم شتانە مەرگ، ژیان، ئەو شتانەی هەموو کەسێک نایاندۆزێتەوە، تەنیا هی چینی بورجواز و کرێکار نییە، هی هەموو مرۆڤایەتییە، رەنگە لە هەندێ وڵاتدا لە هەندێ بارودۆخدا بە شاعیریان وتووە شاعیری چینی کرێکار، ئەمە هەم غەدرە لە شاعیر و هەم لە چینی کرێکاریش، چینی کرێکار چینێکی تێگەیشتوو و باڵادەستترین چینە وەکو بیرکردنەوە و هۆشیاریی و رۆشنبیری، ئەسڵەن ئەو رۆشنبیرە گەورانەی لەناو چینی کرێکاردا دەردەکەون کەم جار لە چینی بورجوازدا دەردەکەوێت، چونکە چینی بورجوا خەریکی شتگەلێکی ترە، بەڵام چینی کرێکار خەریکی خۆئامادەکردنە بۆ ژیانی نوێ، ئەوەش بە رۆشنبیری دەکرێ و بەردەوام خۆی رۆشنبیر دەکات، من بەغەدری دەزانم بڵێم ئەمە شاعیری چینی بورجوایە و ئەمە شاعیری چینی کرێکارە، ئایا کرێکارێک پۆشکین ناخوێنێتەوە کە هی پێش ئەو پۆلاندنەیە، یان کرێکارێک، یان جووتیارێک شیعری رێلکە و بایرۆن و نالی ناخوێنێتەوە کە نالی نەیزانیوە پۆلاندنی چینایەتی چییە وەکو ئەرستۆکرات و بورجوا و کرێکار، ئەوەی حەزی لە شیعر بێت، هەموو شیعرێکی باش دەخوێنێتەوە، شیعر و شاعیر پۆلاندنی نییە.

## شیعری منداڵان

* تۆ لە بوارێکی تردا شیعر دەنووسی، کە بواری دنیای منداڵانە، شیعرنووسین بۆ منداڵ، کاتێک کە شیعری منداڵان دەنووسی، خۆت منداڵ دەکەیتەوە، یان لە دیدی کەسێکی گەورەوە دەڕوانیتە منداڵ؟

– جارێ با باسی ئەوە بکەم بۆ من کەوتمە دنیای منداڵەوە؟ من لە ماڵێکدا گەورە بووم، میوانمان زۆر بوو وا بزانم لە سەرەتاشدا وتوومە ماڵە شێخ بووین، نەخۆش و دەردەدار و شێت زۆر دەهات بۆ ماڵمان و باوکم دەرویشی زۆر بوو، بەهاوین و زستان چیرۆک و دیرۆک و تا دەگاتە داستان لە ماڵی

ئێمەدا زۆر دەگێڕرایەوە، گەڕەکەکەمان پیرەژنی تورکمانیشی تیابوو دەهاتن
بۆ ماڵمان و ئەوانیش چیرۆکی تورکمانییان بۆ دەگێڕامەوە، کوردەکانیش
چیرۆکی کوردییان بۆ دەگێڕامەوە، لەم سلێمانییەوە دۆست و ناسراو و خزمم
دەهاتن بۆ کفری بۆ ماڵمان و بە دە شەو دەمانەوە و هەر هەموو شەوەکان
ئەگەر دروستیشیان بکردایە دەبووایە چیرۆکێک، یان دیرۆکێکم بۆ بگێڕنەوە،
ئیتر مەحاڵ بوو مەجالیان بدەم و شتێکم بۆ نەگێڕنەوە، جگە لەوەش باوکم
بووستان و گوڵستانی سەعدیی دەگێڕایەوە بۆ دەروێشەکان و منیش گوێم لێ
دەگرت، بووستان و گوڵستان بریتین لە دیرۆکی کورت کورتی پەند ئامێز و
شیعر، ئەوانە هەموو کاریگەرییان لە سەرم هەبوو، لە دەرەوەش لەگەڵ
مندالانی گەڕەک هەندێ بەیت و بالۆرە هەبوو، بەکوردی وەکو: هەورەکە گیان
گیان/ دەستم بگرە بێمە بان/ بۆ قارچک و دومەلان/ بەتورکمانیش شتی تر
هەبوو، من رەنگە زۆریم لە بیر نەمابێت، بەلام ئەمە مانای یەکێکیانە بە
کوردی: ئەی خوایە گیان بیکە بەبارانێکی وا دار و دیوار هەمووی تەڕ بێت،
کاتێ کچەکەی مامم لەوێوە تێ دەپەڕێ پێلاوەکانی تەڕ بێت.

ئەمانە وای لێ کردم منداڵێتی لە ناخمدا هەر بەزیندوویی بمێنێتەوە،
دەتوانم بڵێم بەشێکی زۆری منداڵێتیم لە ناخی خۆمدا پاراستووە، لەو
روانگەیەوە کەوتمە نووسین بۆ مندالان، نابێت لە ڕوانگەی گەورەوە بۆ منداڵ
بنووسین، دەبێت لە ڕوانگەی منداڵیی خۆمانەوە بۆ منداڵ بنووسین، هەرچیم
نووسیوە بۆ منداڵ لە ڕوانگەی منداڵیی خۆمەوە نووسیوومە و بوومەتەوە بە
منداڵ، ئایا خۆم وەکو منداڵێک ئەم دەقەم بەدڵە؟ بەدڵم بووبێ، هێشتوومەتەوە
و بەدڵیشم نەبووبێت نەمهێشتووەتەوە و دڕاندوومە و سووتاندوومە، لەم
روانگەیەوە دەنووسم و دەبێت هەموو نووسەرێکیش بەم شێوەیە بنووسێت،
بەلام بەداخەوە، ئێستا گەلێ دەق هەیە بەناوی دەقی منداڵەوە بلاوی
دەکەنەوە، لە پرۆگرامی قوتابخانەکانیشدا هەیە و ئەوانە دەقگەلێکی سەقەت
و مردوون، چونکە ناوەڕۆک و شێوازەکەیان بۆ گەورەیە و بۆ منداڵ ناشێت،
هەر ئەوەندەیە لێی نووسراوە، شیعر بۆ مندالان، یان چیرۆک بۆ منداڵ،

ئەمەش زەبرێکی گەورە دەدا لە پاشەڕۆژی منداڵ، هیوادارم لیژنەکانی دانانی کتێب لە وەزارەتی پەروەردەدا رەچاوی ئەم بارودۆخەی دەق بکا، لە کتێبی منداڵاندا.

* زۆربەی شیعری منداڵان، وەکو پەند و ئامۆژگاری وایە بۆ ئەوەی منداڵان لێوەی فێر بن، شیعری فێرکردنیشمان هەیە، زانیاری بەخشینە، شیعری منداڵان و شیعری فێرکردن، دەتوانین بڵێین لەیەکەوە نێزیکن؟

- ئەگەر بڵێی منداڵ تەنیا جۆرە شیعرێکی دەوێت شیعری فێرکاری بێت، من لەگەڵ ئەوەدا نیم، بۆ نموونە ئەگەر شیعرێک باسی ئەوە بکا: چۆلەکەیەک لەسەر دارێک کەوتە خوارەوە و منداڵێک چوو هەڵی گرتەوە و باڵە شکاوەکەی سارێژ کرد و چاکبووەوە... هتد، منداڵ هەر حەزی لەمە نییە، بگرە حەزی لەوەشە بڵێی: منداڵێک سواری پاسکیلێک بوو و پاسکیلەکە لە خۆیەوە فڕی بە ئاسماندا و لە ئاسمان وەکو پشیلە میاواندی و کە چووە یەکەم تەبەقەی ئاسمان وەکو سەگ وەڕی و لە دووەم تەبەقەی ئاسماندا وەکو مرۆڤ قسەی کرد، منداڵ ئەمەشی پێ خۆشە و ئەمەش وەردەگرێ، چونکە منداڵ بوونەوەرێکە مێشک و عەقڵی بۆ ئەوە دەشێ لەگەڵ هەموو زانست و بارودۆخەکاندا بگونجێ، لە بیرمان نەچێ، منداڵ ئەفسانەی زۆر پێ خۆشە، کاتێک کە پیرەژنێک ئەفسانەیەک بۆ منداڵ دەگێڕێتەوە پێی خۆشە، بۆ نموونە خۆم پیرەژنێک باسی ئەوەی بۆ کردم، مەلیک ئەحمەد کاتێ براکانی خیانەتیان لێ کرد، ئەویش دەرچوو لە ماڵ لە ناکاو گەیشت بەسەرێکی بڕاو، سەرە بڕاوەکە وتی، مەلیک ئەحمەد وەرە مەڕۆ من سێ ئامۆژگاریت دەکەم: دەچی دەگەیت بە سێ رییانێک، بەڕێی راستدا مەڕۆ بەڕێی چەپیشدا مەڕۆ بەڕێی ناوەڕاستدا برۆ، چونکە بەڕێی ناوەڕاستدا دەڕۆیت، دەگەیتە کۆشکێک دارێکی لێیە کاتێک دەگەیتە ئاستی دارەکە گەڵایەکی لێ دەکەوێتە خوارەوە، ئەو گەڵایە لەناو دەستتدا ورد بکە، کە وردت کرد دووکەڵێک پەیدا دەبێت، لە

دووکەڵەکەوە کچێکی جوان لەدایک دەبێت و پێت دەڵێ کارەکەرتم و چیت دەوێ ئامادەم بۆت بکەم، منداڵ ئەم شتانەشی پێ خۆشە و پەسەندیشی دەکات و عەقڵ و ژیریشی وەری دەگرێ.

* کاتێک کە شیعرێکی منداڵان دەنووسی و کاتێک شیعرێکی تر دەنووسی چ جیاوازییەکت هەیە؟.

– تۆ بڵێی ئارمستڕۆنگ کە چووە سەر مانگ، نەیتوانیبێت ئۆتۆمۆبێل، یان پاسکیل لێ بخوڕێ؟ بێگومان من دڵنیام توانیویەتی فڕۆکە و ئۆتۆمۆبێل و پاسکیلیش لێ بخوڕێ، ئیتر هەرکەسەو کلیل و ژمارەی نهێنیی خۆی هەیە دەیکەیتەوە و ئەو بەهرە و خەیاڵەی لێ هەڵدەقوڵێ، من کاتێک بۆ منداڵ دەنووسم لەو کانگایە وشە و گوزارشت هەڵدەگوێزم کە بۆ منداڵە، کاتێکیش بۆ گەورە دەنووسم، لەو کانگایە مێشکم هەڵدەگوێزم کە بۆ گەورەیە.

* خۆشەویستیت بۆ منداڵ وای لێ کردیت، شیعر بۆ منداڵان بنووسیت، یان وەکو حەزێکی خۆت کە کاتی منداڵی حەزت لە شیعر و چیرۆک بووە، بۆیە ویستووتە ئەم نەوە نوێیەی منداڵان شتێکیان پێ ببەخشیت؟

– باوەڕت هەبێ سەرەتا بۆ خۆمم نووسی، وام هەست دەکرد منداڵێکم پێویستیم بەوە هەیە، ئەم بابەتانە بنووسم و بشیانخوێنمەوە، کە یەکەم دیوانم بڵاو کردەوە (جوانترین دێ) چوار هەزار دانەم لێ چاپ کرد لەگەڵ کتێبێکی تردا (ئەو نامانەی دایکم نایانخوێنێتەوە) ئەویش چوار هەزارم لێ چاپ کرد، دەتوانم بڵێم هەردوو کتێبەکە بە چوار هەفتە تەواو بوو، ئەمە منی هان دا، بۆ ئەوەی ئیتر بۆ منداڵ بنووسم، خەزینێکی زۆرم هەبوو بۆ منداڵ لە مێشکی خۆمدا، ئێستاش هەر پێشانگەیەک بکرێتەوە، یان رێم بکەوێتە هەر شارێکی تر، سەرەتا بۆ کتێبی منداڵان دەگەڕێم، بێجگە زمانی کوردی، چونکە من زیاتر سوود لەو کتێبانە دەبینم کە بەزمانی فارسی و عەرەبی نووسراون،

هەندێکیان لێ وەردەگێڕم و هەندێکی تریان سوودی دەروونیان لێ وەردەگرم، ئێستا شانازی بەوەوە دەکەم بەبۆچوونی زۆربەی خوێنەران و منداڵانیش توانیومە باشترین بەرهەمی منداڵان بنووسم، زۆرجار رێکەوتووە بەرێگەیەکدا رۆشتووم، یان لە هەر شوێنێکی تر منداڵم بینیوە دەستی کەسێکی خۆی رادەکێشێ و دەیەوێت بیهێنێت بۆ لای من، کاتێ هاتوونەتە لام دایکی، یان ئەو کەسەی کە لەگەڵی بووە وتوویەتی ئەم منداڵە زۆر حەزی لە شیعر و چیرۆکەکانی تۆیە و هەموو شەوێک دەیانخوێنێتەوە، ئەمە بۆ من مایەی دڵخۆشییە، جارێکیشیان لە کۆمەڵەی رووناکبیری کەرکووک بووم باوکێک منداڵێکی هێنا، بۆ لام وتی ئەم منداڵەم دیوانە شیعرێکی تۆی لەبەرە، منیش زۆر زۆرم پێ خۆشبوو، ئەمانە و دەیان نموونەی تر هەیە، من پێشم خۆش بوو کە خەڵاتی ئاپیکی ساڵی ٢٠٠٠ درا بەبەرگی یەکەمی دیوانی شیعری منداڵانی من، لەلایەن وەزارەتی رۆشنبیریی حکوومەتی هەرێمی کوردستانیشەوە، یان جارێک بوو، یان دوو جار خەڵاتم وەرگرتووە، لە بەڕێوەبەرایەتیی منداڵانیش زۆر سوپاسم بۆ هاتووە، ئێستاش هەموو ساڵێک لە چالاکی و فیستیڤاڵی قوتابخانەکاندا داوای ئۆپەرێتم لێ دەکەن، ئەو ئۆپەرێتانەی دەینووسم، هیچ ساڵێک رەفز نەکراوەتەوە و پلەی باشی هێناوە، لەلایەن وەزارەتی پەروەردەشەوە رێزم لێ نراوە و نامەی رێزلێنانم دراوەتێ.

## خەڵاتی ئاپیک

* چۆن ئەو دیوانەت گەیشتە سوێد و کێ بوو خەڵاتی (ئاپیک)ی دا بەو دیوانەت؟ بە تەرجەمەکراوی نێررابوو بۆ ئەوێ، خۆت ناردت یان نا؟

- ئەو خەڵاتە وا بزانم خانەیەکی بڵاوکردنەوەی کوردی - سوێدی دەیبەخشێ، نازانم ئێستا ماوە، یان نا، حەتمەن دیوانەکەم برادەرێک لەگەڵ خۆی بردوویەتی بۆ ئەوێ و بەکوردی خوێنراوەتەوە و وەکو وتم ئەو خانەی

بڵاوکردنەوەیە ئەو خەڵاتە دەبەخشن کوردی – سویدییە ئیتر، ئەو ساڵە ئەو کتێبەی من بەباش زانراوە و ئەو خەڵاتەی پێشکێش کراوە، لە بیرم نەچێت لە دوو سێ کتێبی قوتابخانەکانی سەرەتاییی منداڵانی کوردی سویددا لە پرۆگرامی خوێندنیاندا شیعر و چیرۆکی من هەیە و دەیخوێنن، لەم رۆژانەشدا مامۆستا حەمەکەریم هەورامی تەلەفۆنی بۆ کردم باسی ئەوەی کرد کە کچێکی لە قوتابخانەیەکی نموونەییدا گەلێ شیعری منی هەڵبژاردووە بۆ پرۆگرامی ئەو قوتابخانەیە و جارێکیشیان کاک حەمەفەریق حەسەن پێی وتم، چیرۆکێکی منداڵانت کراوە بەعیبری و دوو شیعری منداڵانیشم لە کۆوارێکی منداڵاندا کە لە ئەمەریکا دەردەچێت لە رێگەی (فەرهاد شاکەلی) هاورێمەوە ئەو کۆوارەم دەست کەوتووە کراوە بە ئینگلیزی ئەمەریکی.

* واتە خۆت ئاگەدار نەبوویت و ئەو دیوانەت نەناردووە، خەڵکی لە دڵسۆزیدا ئەو دیوانەی بردووە و خەڵاتی وەرگرتووە؟

– من نازانم لەوانەیە دابێتم بە برادەرێکیشم و ئەویش گەیاندبێتییە ئەو شوێنە.

* یەعنی خۆت بۆ ئەو مەبەستە ئەو دیوانەت نەناردووە بۆ سوید؟

– بۆ ئەو شوێنەم نەناردووە، ببڕای ببڕ، ئەو دیوانەی خۆمم بۆ ئەو خانەی بڵاوکردنەوەیە نەناردووە، لە رێگەی خەڵکی ترەوە گەیشتووەتە ئەو خانەی بڵاوکردنەوەیە و من لە رێگەی رۆژنامەی کوردستانی نوێ و ئیتیحادەوە هەواڵەکەم بیست، ئەوسا رۆژنامەی هەرێم هەبوو کاک یاسین بەرزنجی هاورێم لەوێ کاری دەکرد، کە گەیشتمە رۆژنامەی هەرێم، کاک یاسین وتی دەزانی بەرگی یەکەمی دیوانی منداڵانت خەڵاتی ئاپیکی وەرگرتووە؟ وتم چۆن؟ وتی لە کوردستانی نوێدا خەبەرەکە بڵاو بووەتەوە.

* بەهۆی ئەو پێشوازییە زۆرەی کە لە شیعری منداڵانت دەکرێ،

هەست دەکەی شیعری منداڵانت لە ئاستێکی بەرزدایە؟

– من لە زۆر کەسم بیستووە تەنیا باسی یەکێکیان دەکەم، کاک موزەفەر مستەفا، ماستەرنامەی لە چیرۆکی منداڵاندا هەیە، بەبێ لایەنی قسە دەکەم، پێی وتم، هەموو ئەدەبی منداڵانم خوێندەوە لە بەرهەمەکانی تۆ باشترم نەبینی، بۆیە ئەو بەرهەمەی تۆم هەڵبژارد و ماستەرنامەم لەوەی تۆدا هێنا، ئەمە مایەی خۆشحاڵییە بۆ من کە شتێکم کردووە کە رەنگە کەسی تر نەیکردبێت.

* شیعری منداڵانت زۆر کراوە بە گۆرانی یان نا؟

– پێش هەموو شتێ زۆر سوپاسی کاک فوئادی مەولانایی دەکەم، ئەو نەک هەر کردوویەتی بەگۆرانی، بگرە وای لێ کردووە ئەو شیعرانە خۆشەویست بن لای گەورە و بچووک، کە شیعرێکت نووسی و کرا بەگۆرانی و کەسێکی بە توانا کردی زیاتر، دەچێتە ناو خەڵکەوە، خۆم گەلێ جار ئێواران گوێی لێ دەگرم، یەکێک لەو شیعرانەم کە کراوە بەگۆرانی و زۆر زۆر خۆشە (ئەی پۆستەچی)یە، تام و لەزەتێکی زۆر تایبەتی پێ داوە، بەدڵنیاییەوە دەیڵێم زۆربەی بابەتەکانی من لە بواری شیعر و چیرۆکی منداڵدا شێوازێکی نوێیە و رچەشکێنیم تێدا کردووە، زۆر دوورکەوتوومەتەوە لەو زمانە و لەو کەرەستانەی کە نووسەرانی پێش خۆم بەکاریان هێناوە و دنیایەکی تازەم بۆ منداڵی کورد دروست کردووە و من لە هەموو شوێنێک هەست بەخۆشەویستیی منداڵ دەکەم، هەندێ جار کە ۆرک شۆپێک دەکرێتەوە، خاتوو فەوزییە مەنمی، بانگم دەکات دەڵێ، دوو قسە بۆ منداڵ بکە، کە دەچم هەموو منداڵەکان دەمناسن و بابەتی لەتیف هەڵمەتی خوێندووەتەوە، ئەمە بۆ من جێگەی خۆشحاڵییە.

* بەرهەمی بۆ منداڵ نووسراوی کورد لە چ ئاستێکدایە؟

– بەڕاستی زۆربەی بەرهەمی نووسەرانی منداڵ کرچوکاڵ و بێسەروبەرەن.

* چۆن؟

– هەلومەرجی دەقی منداڵیان تێدا نییە.

* بۆچی؟

– چونکە زۆربەی ئەو نووسەرانە ئاگایان لە دەقی بۆ منداڵ نووسراوی جیهان نییە.

* ئایا ئەمە بیروڕایەکی رەق نییە؟

– نەخێر من بەرگری لە منداڵ دەکەم.

* بۆ چارەسەری چی بکەین باشە؟

– بێدەنگی باشە، چونکە بەرپرسانی کورد گوێیان نییە هەر زمانیان هەیە.

## خۆشەویستی

* با بێینە سەر لایەنی خۆشەویستی، هەر کەسێک شیعرەکانت بخوێنێتەوە، بەتایبەتی شیعرە ئاشقانەکانت، خۆشەویستییەکی پاک و جوانی تێدا دەبینێ، بەکردەوەش وایت بەرامبەر بە ئافرەت؟

– بەڕاستی من کە لەدایک بووم عاشق بووم، ئەگەر عەشق نەبێ هیچ شتێک نابێت، عەشق هەندێ جار بچووکە تەنیا بۆ کچێکە، زۆرن ئەو شاعیرانەی کە کچێکیان خۆش ویستووە و ئەو عەشقە بچووکەیان گەورە کردووە و دنیایەکی گەورەیان لێ دروست کردووە و عەشقی کچێکیان کردووە بەعەشقی دنیا، هەر بۆ نموونە مەجنوونی عاشقی لەیلا وای لێ هاتبوو کە لەبەر خۆشەویستیی لەیلا هەموو ئەو ئاسکۆڵانەشی خۆش دەویست کە چاویان رەش بوو، چونکە لەیلا چاوی رەش بوو، جارێکیان برسی بووە ویستوویەتی تیرێک لە ئاسکێک

بدات و راوی بکا کە سەیری کردووە چاوی رەشە لە دڵی خۆیدا وتوویەتی خۆم بمرم لە برساندا باشترە لەوەی ئاسکۆڵەیەک راو بکەم کە چاوی لە چاوی لەیلا بچێت، بێگومان ئەمە عەشقێکی گەورەیە، عەشقیش لای من ئاوایە گەورەیی تێدایە. شاعیرێکم پێ بڵێ عاشق نەبووبێ و شیعرێکی جوانی نووسیبێ.

دەتوانم بڵێم لە تەمەنی دوازدە ساڵییەوە مەسائیلی عەشق و خۆشەویستیم زانیوە، بەڵام باوەڕت هەبێ هەر دووراودوور بووە، خۆشەویستی وشە و دنیای شیعر و دنیای خوێندنەوە دای بریم لەوەی بە لاوی ببم بەعاشقێکی گەورە، هەوڵم دا ببم بە شاعیرێکی گەورە، بەڵام شاعیرێکی گەورە یەعنی عاشقێکی گەورە، چونکە لە دوای (پرچی ئەو کچە رەشماڵی گەرمیان و کوێستانمە)وە بوارم بۆ رەخسا هاوڕێیەتی لەگەڵ یەک دوو کچدا پەیدا بکەم و ئەو دوو کچە توانییان فێری عەشقی حەقیقیم بکەن، رەنگە پێم بڵێی چۆن لە کاتێکدا دوو کچت خۆش بوێت و ئەمەش ناو بنێی عەشقی حەقیقی، ئێمە دەتوانین لە کاتێکدا حەزمان لە دوو سێ میوە بێت زۆر ئاساییە حەزمان لە سێو و پرتەقاڵ و هەناریش بێت، لە کوردێکیان پرسیوە مێوژ دەخۆیت، یان خورما وتوویەتی خورمژ، من وا دەستم پێ کرد، بەڵام لە تەمەنی چواردە ساڵیدا حەزم لە کچێک بوو، ئەویش هەر لە تەمەنی خۆمدا بوو، ئەوە دنیایەکی تایبەتی بۆ دروست کردم، بەڵام وەکو وتم خۆشەویستیم بۆ وشە و شیعر رێگر بوو لەوەی لەو سەردەمەوە ببم، بەعاشقێکی گەورە، من تا ئێستاش هیچ شیعرێکم نەنووسیوە شیعری عاشقانە بێ و بۆ کچێک نەبێت، باوەڕت هەبێ لە شارێک لە شارەکانی وڵاتێکی دراوسێوە، یەکێک تەلەفۆنی بۆ کردووم، دەڵێ ئەو شەهلایە کێیە ئەوەندە ناویت بردووە لە شیعرەکانتدا خۆزگەم بەو شەهلایە، لەبەرئەوەی حەز دەکەم ناوی من لە باتی ناوی شەهلا بووایە، حەز دەکەم هەموو شەهلا ناوەکان بە گوێزان ببرم و ناوی خۆمی لە جێ بنووسم ئاوها، من تا ئێستاش عاشقم هەر شیعرێکی عاشقانە دەنووسم حەقیقەتە و راستەقینەیە و خەیاڵ نییە، کاتێک کە لە عەشق کەوتم، ئیتر شیعر نانووسم.

* ئەی چەند شیعرت نووسیوە، تایبەت بە خۆشەویستەکەت؟

– لەو سەردەمەوە دیوانم هەیە تایبەت بە خۆشەویستەکەم (پرچی ئەو کچە) هەر پێشکێشە بەو کچەی خۆشم ویستووە، دەیان شیعرم هەیە کە بۆ ئەو کچەم نووسیوە و لە شیعرەکەشدا پیتی یەکەم و دووەمی ناوی کچەکەم وتووە، زۆر جار پێیان وتووم، ئەوە چی دەگەیەنێ، بەڵام ئێستا خەڵک دەزانێ ئەو کەسە کێیە و لە یەک دوو چاوپێکەوتنیشدا وتوومە، ئەو کچەی کە زۆرم خۆش دەویست ئەو کاتەی کە شیعرەکانی (پرچی ئەو کچە رەشماڵی گەرمیان و کوێستانمە)م دەنووسی ئێستاش رێز و خۆشەویستیی زۆرم بۆی هەیە، کچە چیرۆکنووسێک بوو گەلێک چیرۆکیشمان پێکەوە تەرجومە کردووە لە رۆژنامەی عێراقدا بڵاومان کردەوە، چیرۆک و رۆمانی بڵاوکراوەی زۆرە، بەڵام بێ ئەوەی ئەو پێی بزانێ من لە هەمان کاتدا کچێکی تریشم خۆش دەویست، ئەو دیوانە رەنگدانەوەی هەردوو خۆشەویستەکەمی تێدایە لەو سەردەمەدا، ئیتر هەموو سەردەمێک یووسف و زولەیخا و شیرین و فەرهادی خۆی هەیە، ئەو سەردەمە من سەرەتای لاویم بوو، خوای گەورە لە لاسارییەکانی لاویمان ببوورێ.

* ئەوە زانیمان دیوانت نووسیوە بۆ خۆشەویستەکەت، ئەی شیعرت نووسیوە بۆ هاوسەرەکەت؟

– بەڵێ بۆ هاوسەرەکەم شیعرم زۆرە، ئەوانەی نزیکمانن لە کەسوکار و خزم و دراوسێ، دەزانن خۆشەویستیی من و هاوسەرەکەم چەند بەهێزە! چونکە هاوسەرەکەم نەخۆشە و بیست ساڵ دەبێت گورچیلەی نەخۆشە و گورچیلەیەکی نەشتەرگەری بۆ کراوە و گورچیلەکەی تریشی بەرد و لمی هەیە، جاری وا هەبووە بەدرێژاییی دەیان شەو من نەنووستووم بەدیاریەوە، جگە لەوەی سەردانی دوکتۆرم پێ کردووە بۆ بەغدا و کەرکووک و تاران و هەر شوێنێک کە لە توانای گیرفانما هەبووبێت بردوومە، تا لە بەغدا لە

نەخۆشخانەی خەیال لای دوکتۆر وەلید نەشتەرگەریم بۆ کرد، تا ئێستاش نەخۆشە، خۆم گەلێ ئیشی ماڵەوە دەکەم، ئەوە هەمووی خۆشەویستیمە بۆ هاوسەرەکەم کە ئامۆزا و پورزایشمە، لەبەرئەوە خۆشەویستییەکەمان پتەوتر بووەتەوە، جگە لەوەش خۆشەویستییەکی مرۆڤانەشم بۆی هەیە، چونکە ئەو نەخۆشە و شەش منداڵیشمان مردووە کە بەلای ئەوەوە زۆر کەسەرە، بەڵام بەلای منەوە ئاسانترە و بەرگەی ئەو ناخۆشییەم گرتووە و زۆرجار دڵخۆشیی دەدەمەوە و دڵنەوای دەکەم، ئەمەش لە خۆشەویستی بەولاوە هیچی تر نییە بۆ هاوسەرەکەم، بەڵام ئەمە ڕێم لێ ناگرێت کچێکی جوان ببینم، یان ڕوحم پێوەست بێت بە کچێکی جوانەوە، شیعرێکی بۆ بڵێم، خۆ ئەگەر خۆشەویستی مرد، شیعری جوانیش دەمرێ، بەتایبەتی لەو کاتانەی کە هاوسەرەکەم نەخۆش بووە، یان منداڵەکانمان مردووە، شیعرم بۆ هاوسەرەکەم هەیە، ئەویش یاریدەدەرێکی باشمە کە نەخۆش نەبێت زۆرجار من بۆ ماوەی پێنج سەعات دەنووسم ئەو ئەرکم بۆ دەکێشێ و ژوورەکانم پاک دەکاتەوە و کتێبەکانم ڕێک دەخات، ئەمە هەمووی یارمەتیدانی منە بۆ شیعر، من هەست بەوە دەکەم.

* زۆر باسی ماچت کردووە لە شیعرەکانتدا، ماچ لای تۆ چی دەگەیەنێ و بەچ مەفهومێک بەکارت هێناوە؟

– وەڵا ماچ ماچە و هیچ شتێکیش نییە لە ماچ خۆشتر بێت، لە لەدایکبوونەوە هەتا مردن ماچ زەرورییە، ئەوەشی لە شیعرا باسم کردووە، هەمووی ماچی حەقیقییە و خۆشەویستی هەر بووە و هەر دەشبێت هەتا با بڵێین، هەتا کچێک و کوڕێکیش یەکیان خۆش بوێت لە گەردووندا شیعری خۆشەویستی و عەشقنامە هەر دەمێنێ، شانازییش بەوەوە دەکەم کە یەکێکم لە عاشقە گەورەکانی سەدەی بیست و یەک لە عەشقێکی ڕاستەقینە و حەقیقیشدام و ئیبن عەرەبی و مەلای جزیری و ئیبن فارز و دەیان سۆفی و خواناسی تر عاشقی ژن و کچی جوان بوون.

* زۆرجار دەبیستین دەوترێ خۆشەویستیی پێش ژیانی هاوسەرگیری و دوای ژیانی هاوسەرگیری جیاوازە، ئەم جیاوازییە بوونی هەیە، بوونی نییە؟ لای تۆ چۆنە؟

- من پێوەستم بە شتە روحییەکانەوە، رەمەزان دێت رۆژوو دەگرم، رۆژانەش هەوڵ دەدەم هەر پێنج فەرزەکە نوێژ دەکەم، کە جەژنی مەولوود دێت، پارەم هەبێ مەولوود دەکەم، کە بەرات دێت ئەوەندەی دڵی منداڵی پێ خۆش بکرێت بە زیادەوە داوونەریتی بەرات دەکەم، لە جەژنەکانی رەمەزان و قورباندا هەموو داوونەریتەکان جێبەجێ دەکەم، ژیان برێتییە لە گۆڕانکاری، ژیان خەتێکی راست نییە لە لەدایکبوونەوە تاکو مردن، هەندێ کەس هەیە خەتێکی راست و چەپ دێنێت بەم داوونەریتە روحییانەدا بەڕاستی ئەگەر ئەم داوونەریتە روحیانەمان خەتی راست و چەپ پیاهێنا، ژیان هیچ لەزەتێکی تێدا نامێنێ، من نازانم مەبەستت لە خۆشەویستیی پێش هاوسەرگیری و دوای هاوسەرگیری چی بوو، ئێستاش هەموو گەردوونم خۆش دەوێت، ئێستاش شیعرێکی جوانم خۆش دەوێت، ئێستاش کە رۆمانێک دەخوێنمەوە بەدڵمە دووبارە لەدایک دەبمەوە و دەژیمەوە و هەست دەکەم خۆشەویستیم بۆ گەردوون و رۆمانە جوانەکان زیاد دەکات، کە جوانیی کچێک دەبینم، جوانیی زیاترم خۆش دەوێت و زیاتر لەزەت لە جوانی وەردەگرم خۆشەویستی بەردەوامە، من باسی کەسی ئاسایی ناکەم، باسی شاعیر دەکەم، شاعیرێکی حەقیقیم و خۆشم بە شاعیرێکی حەقیقی دەزانم، بەلای منەوە خۆشەویستی لە منداڵییەوە هەتا مردن، وەکو نان و ئاو وەکو هەوا پێویستە.

* زۆر رۆشنبیر و نووسەرمان بیستووە، وتوویانە فلان کتێب، یان نووسینەکانی فلان کەس توانیی مەجرای ژیانی من بگۆڕێ، کێ توانیی لەتیف هەڵمەت بیگۆڕێ، کەسێک هەیە کە توانیبێتی وای لێ کردبیت، بەردەوام لە گۆڕابکاریدا بیت؟

– بەڕاستی هیچ کتێب و دەقێک نییە دەستنیشانی بکەم، بڵێم فلان کتێب، بەڵام من لەماڵێکدا گەورە بووم وا بزانم لە سەرەتای قسەکانیشمدا باسم کردووە، رۆشنبیر و پڕ لە کتێب و هەروەها پڕ بوو لەو کەسانەی لە بواری کولتووری کوردی و چیرۆکی گوێ ئاگردانا شارەزا بوون، من بەختەوەر بووم ئەو رۆشنبیرییانەم هەمووی وەرگرت و کاریگەریی ئەو رۆشنبیرییانەم لەسەر بوو، زمانی عەرەبییش باش دەزانم کە کەوتمە خوێندنەوەی کولتووری عەرەبی هەر لە رێگەی زمانی عەرەبییەوە، زۆربەی زۆری ئەدەبی رووسی لە پۆشکینەوە هەتا لێرمنتۆف و رۆمانەکانی دیستۆفسکی و گۆگۆل و تۆلستۆی دەخوێنمەوە و خوێندویشمەتەوە، شیعرەکانی پۆشکین و دەیان شاعیری تر و ئەدەبی ئەمەریکی و بەریتانی و فرەنسی وەکو شیعر زۆر کاریگەرییان لەسەرم هەبوو بەتایبەتی تەوژمی شیعری نوێ وەکو بۆدلێر و رامبۆ و دواتر جاک بریڤێر، ئەمانە کاریگەریی زۆریان لەسەرم هەبوو، لە عەرەبەکانیشدا، بەدر شاکر سەیاب و محەمەد ماغۆت و ئەدۆنیس و عەبدولوەهاب بەیاتی و گەلێ لە هاوچەرخەکانیان، هەروەها لە شاعیرانی ئەوروپاش، ئیلیۆت و عەزرا پاوەن و واڵت ویتمان و مایکۆفسکی و پۆشکین و باسترناک و ئەوانە هەموو توانییان رۆشنبیریی من بگۆڕن و کاریگەریی تەواویان لە سەرم هەبێ، کە سەیری هەڵسوکەوتی خۆم دەکەم، زۆر کاریگەریی ئەو نووسەرانەم لەسەرە.

* بەپێی تێپەڕبوونی کات، دەبێت ئەدەب بەرەو پێش بچێت و نوێ بکرێتەوە، پێت وایە، ئێستاش ئەدەبی کوردی ماویەتی بۆ خۆنوێکردنەوە و گەیشتن بەئاستێکی باڵا و لووتکە؟

– بە بۆچوونی من، شیعر و ئەدەب رووبارێکی وەستاو نییە، خۆی دەڵێن، ئەو ئاوەی کە بەیانی بە رووبارێکدا رۆشتووە، ئەو ئاوەی کە ئێوارە پێیدا دەڕوا، هەمان ئاوی بەیانی نییە، ئاوێکی نوێیە، ئاو لە سروشتیشدا بەشێوەیەکی بازنەیی خۆی نوێ دەکاتەوە، لە دەریاوە دەبێت بە هەڵم و دووبارە دەبێتەوە بە باران و... هتد، شیعریش وایە دەبێ هەردەم خۆی نوێ بکاتەوە، کە دەڵێم

شیعر، باسی هەموو دەقە ئەدەبییەکان و بابەتە هونەرییەکان دەکەم، ناکرێت شانۆی ئەمڕۆ وەکو شانۆی سەردەمی شێکسپیر دەربهێنرێت و ئەکتەرەکانیشی وەکو ئەو سەردەمە نواندن بکەن، ناکرێت ئێمە ئەمڕۆ شیعرێک بنووسین لاساییکردنەوەی نالی و ئەحمەدی خانی و مەلای جەزیری و مەحوی بێت، زیاتر باسی فۆرم دەکەم، فۆرمی شیعر، یان فۆرمی دەقە ئەدەبییەکان، ئەگینا ناوەڕۆک با بڵێین عەشق و تەماحکاری لە دێرزەمانەوە هەن، لێبووردن و توندوتیژی لە زەمانی هابیل و قابیلەوە هەیە، یان لە یەکەم ناکۆکیی خوا و شەیتانەوە هەیە، ئێستاش ململانێکان هەن، بەڵام هەموو رۆژێ جۆرێکی ترن، دەبێ شیعریش بەردەوام خۆی نوێ بکاتەوە، هەر بۆ نمونە ئەمڕۆ دنیا پێش کەوتووە جاران تەنیا رادیۆ هەبوو ئێستا تەلەفزیۆن و سەتەلایت و ئینتەرنێت هەیە، ئەمە پێشکەوتنێکە و زانست دۆزیویەتییەوە مەگەر خوا و ئەوانەی لە بواری زانست و فیزیا و تەکنەلۆجیادا کار دەکەن، بزانن پاش چەند ساڵێکی تر چی شتێکی تری نوێ دێتە ئاراوە، خۆ نابێ ئەمانە لە قالبێکدا بمێنێتەوە، تەلەفۆنیش هەروا جاران تەنیا دەنگی دەگواستەوە ئێستا لەگیرفانتایە و هەموو جۆرە مواسەفاتێکی هەیە، شیعریش نابێ لە قالبێکدا بێت، ئەگەر لە قالبێکدا بێت دەمرێ، بە بۆچوونی من شیعر و دەقە ئەدەبی و هونەرییەکان دەبێ رۆژ بەرۆژ لە خۆ تازەکردنەوەدا بن و لە بارودۆخێکی ئەزموونگەریدا بن بەبێ ئەزموونگەری کفن و دفنی خۆیان دەکەن.

## کەناڵەکانی راگەیاندن

* ئێستا بێجگە لە کەناڵ و رادیۆ لۆکاڵییەکان، نیزیکەی پازدە شازدە کەناڵی ئاسمانیمان هەیە، تۆ کەم لە شاشەی کەناڵەکانەوە دەردەکەویت، هەست ناکەی ئەو دوورەپەرێزییەت لە کەناڵەکانەوە وەکو خۆی کە هەیە دەرنەکەوتووە؟

- با شتێکت پێ بڵێم، کەناڵەکانی راگەیاندن بەڕاستی ئەوەی کە پشتگوێیان خستووە بوارە رۆشنبیرییەکەیە، زیاتر بۆ گۆرانی و هەڵپەڕکێ و نوکتە تەرخان کراوە، سەیری ئەو بەرنامانە بکە کە بە شوێنە گشتی و هاوینەهەوارەکاندا دەگەڕێن بەسەر ئەو خێزانانەدا کە چوون بۆ سەیران، ئێ چۆنی چاکی؟ دەتوانی نوکتەیەکمان بۆ بڵێی؟ ئەمە ئیتر یەعنی کورد، هیچی تر نییە نەتەوەی نوکتەیە، یان لەو سەیرانانە هیچ هونەرێکی تر نییە تەلەڤزیۆن بیخاتە روو تەنیا هەڵپەڕکێ نەبێ، یان تەلەڤزیۆنێکی گەورە و گران کە رەنگە هەر خولەکێک سەد تا پێنجسەد دۆلار خەرج دەکات لە پەخشی بەرنامەکانیدا لەگەلێ ئاهەنگ و شتەکاندا کە دەگەڕێ دەڵێ، خۆت ئامادە کردووە؟ خۆی بۆچی ئامادە کردووە، گوایە خۆت ئامادە کردووە بۆ سەیران و هەڵپەڕکێ و نوکتەیەکی خۆش بگێڕیتەوە، رۆشنبیری بەتایبەتی رۆشنبیرییەکی هاوچەرخ لە کەناڵەکانی راگەیاندندا بە تەلەڤزیۆن و رادیۆوە لە ئاستی پێویستدا نییە.

* هۆکاری دوورەپەرێزیت لە کەناڵەکانی راگەیاندن؟

- من دوورەپەرێز نیم، کەناڵەکان دوورەپەرێزن لە رۆشنبیران و رۆشنبیری، تۆ پێم بڵێ چەند هونەرمەند و چەند نووسەری ناودار و گەورە و بەتوانا لە راگەیاندنەکاندا ئیش دەکەن؟ تۆ پێم بڵێ، تەنانەت ئەوانەی بەرنامەیەکی هونەری لەبارەی شانۆ و شانۆکاری و سینەما پێشکێش دەکەن، خۆیان لەو بوارەدا ناوێک نین لە شانۆ و سینەما و هونەری شێوەکاریدا، بەڵام بەرنامەیەکیشیان وەرگرتووە، ئەوە بەرنامەی ئەدەب و شیعر هەر زۆر زۆر کەمە، لەگەڵ ئەوەشدا من بەختەوەرم گەلێ جار چاوپێکەوتن و دیدارم لەگەڵدا کراوە، بەڵام زیاتر دەرنەکەوتنی من و کەسانی تریش کە رۆشنبیر و شاعیر و هونەرمەند و کەسانی ناسراون و بەرهەمیان پێشکێش کردووە لە بوارە هونەری و ئەدەبییەکاندا، کەناڵەکان زۆر بەپیریانەوە ناچن، زۆر نایانخەنە روو و لایان لێ ناکەنەوە، تەلەڤزیۆن زیاتر بایەخ بەشتە ئاساییە رۆژانەکان

دەدات، هەندێ جار ئەو بێژەرەی کە هەواڵەکە دەخوێنێتەوە، ئەگەر هەواڵەکە دە چرکە بخایەنێت دە هەڵەی تیا دەکات، ئیتر ئەمانە چۆن بیر لە مەسائیلی رۆشنبیری و چاوپێکەوتنی نووسەران دەکەنەوە، ئەگەر بمانەوێت ئێمە راگەیاندنێکی هاوچەرخانەمان هەبێت دەبێت بەبەرنامە و پرۆگرامەکانی راگەیاندندا بچینەوە و کەسی لەبار بۆ شوێنی لەبار دابنرێ، ناکرێ و نابێ و نەبووە و ناشبێ، نەتەوەیەک لە بواری رۆشنبیریدا پێش نەکەوێ و لە بوارەکانی تردا پێش بکەوێ.

## کاریگەری

* تەنیا لەلایەنی شیعر و ئەدەبیاتەوە کاریگەریی کولتوور و رۆشنبیریی عەرەبیت لە سەرە، یان لایەنەکانی تری وەکو هونەرەکان و هەڵسوکەوت و بیرکردنەوەی عەربت لە سەرە؟

- وەڵا کاریگەرییەکی تێکەڵم لە سەرە، من لە شارێکدا ژیاوم کورد و عەرەب و تورکمانی تێدا بووە، لەبەرئەوە چەند گوێم لە گۆرانیی کوردی گرتووە، بەڵام گۆرانیی سەرکەوتوو ئەگەر رووسێکیش گوێی لێ بێت دەزانێت ئەوە گۆرانیی کوردییە، گوێم لە سەید عەلی ئەسغەر و عەلی مەردان و سێوە و تایەر تۆفیق و حەسەن زیرەک و کاوێس ئاغا و محەمەد عارف جزیری و ئەم جۆرە گۆرانییانە گرتووە، بەڵکو هاوشانی ئەمانە گوێم لە ئوم کەلسوم و عەبدول حەلیم و محەمەد عەبدولوەهاب و فەرید ئەترەش و ئەسمەهان و نازم غەزالی و شادییە و گۆرانیبێژە ناودارەکانی عەرەبیش گرتووە، چونکە لە شارێکی فرەنەتەوەدا ژیاوم، گوێم لە گۆرانیی تورکمانیش گرتووە، گوێم لە هەموو هونەرێکی رەسەن گرتووە، ئێستاش گۆرانییەکی سەرکەوتوو هەبێت، هی هەر زمانێک بێت، گوێی لێ دەگرم، بەڵام زیاتر گوێ لە گۆرانیی کوردی دەگرم، ئەم کاریگەرییەی هونەری غەیرە کورد لە سەر من پێویستە، جارێکیان چاوپێکەوتنێکم لە رۆژنامەی هاوکارییدا خوێندەوە گۆرانیبێژێک بوو نازانم

ناوی چی بوو، بیرم نەماوە، دەڵێ من گوێ لە عەلی مەردان دەگرم، پەیامنێرە کوردەکە لێی دەپرسێ، چی لە کوردی دەگەیت؟ دەڵێ هیچ لە کوردی نازانم، بەڵام من لەو ریتم و ئیقاعەی عەلی مەردان سوود وەردەگرم، چونکە هەر کە گوێم لە گۆرانییەکەی بوو، زانیم ئەمە هونەرمەندێکی گەورە و باڵایە، منیش کاتێ شیعری بەدر شاکر سەیاب و عەبدولوەهاب بەیاتی و ئیلیۆت و ئەدۆنیس دەخوێنمەوە، هەست دەکەم ئەمانە شاعیرگەلێکی گەورەن و روحییەن کەڵکیان لێ وەردەگرم، چ جای لەوەی لە رووی هونەری شیعریشەوە لە سەرەتای تەمەنمدا زۆر شتیان فێر کردووم کە شاعیرە کوردەکانی پێش خۆم پەییان پێ نەبردووە و نەیانتوانیوە فێرم بکەن، کەواتە من ناچار بووم شیعری ئەوروپی و عەرەبی بخوێنمەوە بۆ ئەوەی ئەو شتانە فێربم، کە شاعیرە کوردەکانی پێش خۆم نەیانزانیوە و پەییان پێ نەبردووە.

## پێوەندیی شیعر و وەرزش

* بێجگە لە شیعر و نووسین و خوێندنەوە، چ ئارەزوویەکی ترت هەیە؟

- زۆر سەیرە، من بە منداڵی زۆر حەزم لە سەیری یاری بوو، ئەو دەمانە کەرکووک و کفری و خورماتو و خانەقین و هەندێ جار بەغدایش یاریی تۆپی پێی و سەبەتەیان دەکرد، من لە سەیری ئەو هەموو یارییانەدا ئامادە دەبووم، جارێکیان تیپی هەڵبژاردەی کفری و تیپی کۆمپانیایەکی ئینگلیزی یارییان کرد، زۆر زۆرم پێ خۆش بوو، هەڵبژاردەی کفری دوو گۆڵیان لە تیپی کۆمپانیای ناوبراو کرد و کفری سەرکەوت بەسەریاندا، من ئێستا بۆم دەرکەوتووە پێوەندییەکی زۆر گرینگ هەیە لە نێوانی شیعر و وەرزشدا.

* ئەو پێوەندییە چۆنە؟

- ئەگەر سەیری تیپێکی تۆپی پێ بکەین، ئەگەر یەک یاریچی لاواز بێت، یان

یەک یاریچی لە تیپەکەی خۆی توورەبێ و حەز بکا تیپەکەی لەبەر هەر هۆیەک بێت، بیدۆڕێنێ، ئەو تەنیا یاریچییە دەتوانێ ببێتە هۆی ئەوەی تیپەکەی بیدۆڕێنێ، هەروەها لە دەقێکی شیعریشدا وشەیەک لە جێگەی خۆیدا دای نەنێیت، وشەیەک پڕبەپێستی ئەو شوێنە نەبێت کە دەتەوێ دای نێیت دەتوانێ ببێتە هۆی ئەوەی تۆوێکی سەرنەکەوتن لەو دەقەدا بچێنێ و ببێتە مایەی ئەوەی زۆر سەرنجی خوێنەر رانەکێشێت، من تازە ئەم پێوەندی و پێوەستییەی نێوانیانم هەست پێ کردووە.

* کەواتە تۆ لە منداڵیدا ئارەزووی وەرزشت زۆر بووە، ئێستا ئەو ئارەزووەت ماوە؟ سەیری یاری دەکەیت؟

- بەڵێ، بە منداڵی، نەک هەر ئەوەی سەیری یاری بگرە نێزیکەی ساڵێکیش یاریی ئاسنم دەکرد، برادەرێکم وتی کاکە تۆ باڵات زۆر گونجاو نییە بۆ یاریی ئاسن، ئەگەر سێ چوار ساڵ لە سەر یەک یاریی ئاسن بکەی، دەنووسێی بە زەوییەوە و هەر نیو مەترت دەمێنێتەوە، ئیتر نەموێرا یاریی ئاسن بکەم، بەڵام بەردەوام دەچووم بۆ سەیری یاریی تۆپی پێ و یارییەکانی تر کە لە سەردەمی منداڵیمدا دەکرا، زۆرجار گەرما بوو، کفری شارێکی زۆر گەرمە، هاوینان زۆر گەرم بوو بە شووشە ئاومان لەگەڵ خۆمان دەبرد، ئەوسا سەلاجە و شتی واش نەبوو ئیتر ئاوەکەش گەرم دەبوو هەر دەمانخواردەوە، لە بیرمە جارێکیان یاریچییەک زۆر زۆر تینووی بوو گۆلاوێک هەبوو، من بەتەبیعەت زۆر بێزم لەو گۆلاوانە دەبێتەوە، بینیم یاریچییەکە بینی نا بەو گۆلاوەوە. ئێستاش بەردەوام سەیری یاری دەکەم، بەڵام گرینگ نییە بەلامەوە کێ دەیباتەوە و دەیدۆڕێنێ، بەڵام هەندێ جار، هەندێ یاریچی کە زۆر ناوی دەرکردووە و ئیتر دەیکەن بەچەپڵەڕێزان بۆی کاتێکیش سەیری دەکەم یاریکردنەکەی لە یاریی یاریزانێکی کەمناو باشتر نییە، بەڵام هەر ئەوەیە ناوی دەرکردووە، دەیکەن بەچەپڵەڕێزان بۆی لە خۆمەوە رقم لێی دەبێتەوە دەڵێم ئەمە نیوەی پڕوپاگەندەیە بۆی، دەکەن حەز دەکەم ئەو تیپە بیدۆڕێنێ کە بەپۆز لێدانەوە

یاری دەکات، جارێکیان یاریچییەکی بەناوبانگ، ناوی نالێم، هەر نەیدەتوانی یاری بکا، یاریچییەکی تر زۆر لەو جوانتر یاریی دەکرد کەچی خەڵک چەپڵەیان بۆ ئەوی تر لێ دەدا ئەم لایەنگیرییە لە سەر بنەمایەک نەبێ پێم ناخۆشە، بەڵام بەردەوام سەیری یاریی تۆپێ پێ دەکەم، جاران سەیری یاریی مشتەکۆڵەشم دەکرد تەنانەت عەدنان قەیسی، بەس ئێستا پێم ناخۆشە بە مشتەکوڵە لە یەکتری دەدەن، بەڕاستی بە کارێکی نامرۆڤانەی دەزانم، سەیری ناکەم، کارێکی زۆر دڕندانەیە، سەیرە پارە ئەوەی دەوێ مرۆڤ بەم جۆرە شێتگیرییە پەیدای بکات.

* زیاتر حەزت لە چ خواردنێکە؟

- وەڵاهی لە خواردندا تەنیا حەزم لە گۆشتی باڵندەیە، ببڕای ببڕ مەگەر ببێ بەتووشمەوە و هیچی تر نەبێ بیخۆم، وەکو ئەوەی میوان بم لە شارێک، ئیتر ناچار بم، ئەگینا ئەو باڵندەیەش بە بەرچاوی خۆمەوە سەری نەبڕن نایخۆم، نەوسنیش نیم، تا ئێستا ناچاری نەبووبێ، دەستم بۆ گۆشت نەبردووە، خواردنی سەرەکیشم برنج و شلەیە بەتایبەتی گۆشتاوی مریشک، یان شلەی پاقلە و فاسۆلیای وشک، حەزم لە فاسۆلیای تەڕ و کولەکە و قەیسی و بامێ و باینجان نییە و هەر نایخۆم. خواردنی چەوریش ناخۆم، چونکە ماوەیەک کۆلیسترۆڵم زۆربوو، ئێستا دەترسم، لەبەرئەوە، پارێزگاریی خۆم دەکەم بۆ ئەوەی کۆلیسترۆڵم زیاد نەکات.

* ئەی ماڵەوەشتان هەروان؟ لەو بارەیەوە کێشەتان نابێ؟

- لە ماڵەوە رێ لە هیچ خواردنێک ناگرم، چی لێ دەنێن لێی بنێن، ئەگەر وابوو شتێک نەبێت، من بیخۆم بۆ خۆم نان و ماستێک دەخۆم، ئەوە گۆشتی سوور بەناچاریش ناخۆم، جەژنیش نایخۆم.

* وا دیارە زۆر گوێ بەجلوبەرگ و خۆ رازاندنەوە نادەیت؟

- من نامەوێ زۆر بایەخ بەجلوبەرگ بدەم، چونکە دەبینم سەدان کەس لە نێر و مێ بایەخی زۆر زیاد دەدەن بەجلوبەرگ و زیادەڕۆیی دەکەن لە هەڵبژاردنی مۆدێلی جلوبەرگدا، پیرۆزیان بێت، هەندێکیان هەن زۆر یاخین ئەو یاخیبوونەیانم بەدڵە و پەسەندی دەکەم، بەڵام بەداخەوە کە قسەیان لەگەڵ دەکەی، مێشکیان لە ئاستی ئەو یاخیبوون و جلوبەرگەدا نییە کە هەڵیان بژاردووە، ئەگینا من پیرۆزبایی لەو یاخیبوون و سەرکێشییەی لاوان دەکەم، کە بە پۆشاک و ملوانکەی جوان دەری دەبڕن و هەندێ جار لاوان دەبینم بازنیان کردووەتە دەستیان، یان ملوانکەیەکیان کردووەتە ملیان، زۆرم پێ خۆشە ئەو سەرکێشییەی لاوان سەرنجم رادەکێشێ، بەڵام کاتێ قسەی لەگەڵ دەکەم هەست دەکەم کتێبێک، رۆژنامەیەک، کۆوارێکی نەخوێندووەتەوە، جێی داخە تەنیا سەیری کەناڵەکانی سەتەلایتی کردووە، کە ئەوانەش مرۆڤ زیاتر لە رۆشنبیری دوور دەخەنەوە، بە بۆچوونی من تەنیا کتێب و کتێب و کتێب، ئاستی رۆشنبیریی مرۆڤ بەرز دەکاتەوە لەگەڵ رادیۆ.

* کەواتە زیاتر بایەخ بە ناوەڕۆک بدەین وەک لە روخسار؟

- من زیاتر بایەخ بەناوەڕۆک دەدەم، بەڵام جلەکانیشم، بۆ نموونە ئەمڕۆ ئەو کراسەم لەبەر کردووە بۆ من گرانە، بیست هەزارم پێ داوە لە شەقامی مەولەوی کڕیومە، کوودەرییە و گەرم نییە، حەزم لە جلی نایلۆن نییە، پانتۆڵیش زیاتر کابۆ لەپێ دەکەم، ئیتر کابۆش بە چل هەزار بیکڕی و بە پێنج هەزار بیکڕی لە سەر شۆستەکاندا رەنگەکەی هەر وەکو یەکە، ئیتر لەبەرئەوە جلێکی گرانیشم لەبەر کردبێ، وا دەزانی لەسەر شۆستە کڕیومە.

* دەزانم پێوەستی بەدینەوە؟ ئەو ریشەی هێشتووتەوە زیاتر لەبەر لایەنە دینییەکەیە، یان هەر خۆت حەزت لێیە؟

- ئێستا ریشم هەیە و جارانیش لە ساڵی ٧٥ یشدا هەر ریشم هەبوو، بەدرێژاییی حەفتاکان چەند جارێک و بەدرێژاییی هەشتاکان چەند جارێک و

بەدرێژاییی نەوەدەکانیش چەند جارێک ریشم دەهێشتەوە،ساڵێ دوو ساڵ و دواتر دەمتاشی، بەڵام ئێستا بڕیارم داوە کە ریشم نەتاشم، چونکە ئەو کەسەی کە سۆزی روحیم لەگەڵیدا هەیە، پێم دەڵێ ریشت لێ دێ و ئەم ریشەت مەتاشە.

## سەفەری دەرەوە بەتەیارە

* هەرچەندە ناشوێری سواری تەیارە ببیت، بەنیازی سەفەر بکەیت؟

– وەڵاهی خەبەرێکم بۆ هاتووە و سەفەرێکیان بۆ رێک خستووم، هەندێک جار دوودڵیشم بەو سەفەرانە، سەفەرێکی رۆشنبیرییە ئەگەر سەری گرت، زۆر ئاساییە، من لە تەیارە زۆر دەترسم، بە لامەوە سەیرە تەیارە بە ئاسمانەوە دەفڕێ و ناکەوێتە خوارەوە، بەڵام بڕیارم داوە، ئەگەر سەفەرەکە سەری گرت بچمە ناو تەیارەوە، بەس بەخوا خەمی، خۆمم نییە، خەمی ئەو نەفەرانەمە کە لەگەڵمان، دەترسم بچمە ناو تەیارەکەوە و خوانەخواستە ئەو تەیارەیە بکەوێتە خوارەوە و نەفەرەکان زەرەر ببینن.

* ئەی حەزت لە سەیران و گەشتکردن هەیە؟

– حەزم لە گەڕانی شاران هەیە، لەو کەسانە نیم حەز بکەم دەرچم بچم بۆ دەشتودەری دەوروبەری شارێک کە تیای دەژیم، بەڵێ حەز دەکەم زۆربەی شارەکان بگەڕێم، بەڵام شارەکانی عێراق وێرانە و ناوێرم بچم و بەڕاستی دەیڵێم ژیان خۆشەویستە و ئینسان خۆی نەکات بە قوربانی سەرکێشیی تیرۆرستێک کە خۆی بتەقێنێتەوە، حەزم لە زیارەتی مەرقەدەکانە، ئەمەت بەلاوە سەیر نەبێ، من هەر لە منداڵییەوە ماڵی باوکم کە دەچوون بۆ نەجەف و کەربەلا و کووفە و ئیمام مووسای کازم و شێخ عەبدولقادری گەیلانی، باوکم لە کتێبخانەکانی شێخ عەبدولقادری گەیلانی و ئیمام مووسای کازم و لەو

شوێنانە کتێبی دەکڕی و بەفارسییش قسەی دەکرد، باوکم یەکسەر ئەوەشی بەئەوان دەوت کە سەیدە و نەوەی ئیمامی عەلییە، ئیتر زۆر خۆشەویست دەبوو، جێگەکەی خۆیان بۆ چۆڵ دەکرد و هەندێ جار بە زۆر داوایان لێ دەکرد دەعوەتیان بێت، بەڵام بیرم نایە جارێ لە جاران چووبێتین، بەڵام زۆرجار لە نرخی کتێبەکان زۆریان بۆ دادەشکاند، بەتایبەتی کە دەیانزانی کوردین و شێخین، شێخ واتە لە نەوەی ئیمامی عەلی، منیش سوودم لەو کتێبانە دەبینی زۆربەی کتێبەکان عەرەبی بوون و هەندێکیان فارسی.

بەڵێ من حەزم لەم جۆرە سەیرانانە هەیە، ئێستا بە ئاواتەوەم، بە یادی منداڵییەوە، بڕۆمەوە بۆ زیارەتی ئیمام مووسای کازم و شێخ عەبدولقادری گەیلانی و نەجەف و کەربەلا و ئەو مەرقەدانە، بەڵام بارودۆخ لەبار نییە، بۆ ئەوەی ئەو خواستانە یاد بکەمەوە و دووبارە جێبەجێیان بکەم.

* لە شارێکی وەکو کفریدا ژیابێتن، خۆ فارسی تیانەبووە، چۆن باوکت فارسیی زانیوە؟

– کاتێ کە باوکم خوێندوویەتی، مامۆستای تایبەتیان بۆ گرتووە، باپیرم ڕێبەرێک بووە لە ڕێبەرەکانی ڕێبازی قادری، مەلا و مامۆستای ئەو سەردەمە زۆر روویان لە تەکیەکەی کردووە و مامۆستای تایبەتی باوکمیان فێری فارسی کردووە (جارێکیان رەمەزان بووە، نان و چا ئامادە کراوە و چاوەڕێی بانگ بوون مەلای تەکیەکە ناوی مەلا سدیق بووە زۆر حەزی لە چا بووە لەپڕ گوتوویەتی: چایی دانراوە بەتفاقەوە عالەمی کوشتووە بە مەراقەوە)، باوکم حافزی شیرازی و بێدڵ و جەلالەدینی رۆمی و فەرەیدەدینی عەتار و شێخی سەعدیی وەکو چۆن من و تۆ کوردی دەخوێنینەوە ئەو ئاوا ئەو فارسییانەی دەخوێندەوە، باوکم شیعری فارسیشی هەیە بۆ حەزرەتی حەسەن و حوسێن و ئیمامی عەلی، وا دەزانم شەوێ بە هەندێ دەستنووسی باوکمدا دەچوومەوە دەستنووسی زۆر بوو، زۆربەیان لە ناوەندی هەشتاکاندا کە تەرحیل کراین بۆ دارەتوو و لەوێوە رامان کرد بۆ چەمچەماڵ خۆمان شاردەوە و لەوێشەوە بۆ

سلێمانی ئەو دەستنووسانە زۆری فەوتان، بەڵام هەندێکی لە ڕێگەی خوشک و براکانمەوە گەیشتنە من و لای من پارێزراون، وا بزانم دەقێکی تێدایە، شیعرە بە فارسی باوکم نووسیویەتی.

* حەزت لەوە هەیە دۆستێکت، خزمێکت بانگهێشتت بکات بۆ ئاهەنگێکی ژن گواستنەوە، یان مارەبڕین بێت بچیت؟حەزت لەو جۆرە بۆنانە هەیە؟

- ناخۆشترین سات لای من ئەوەیە کە خزمێک، یان برادەرێک تەلەفونم بۆ دەکات، یان کارتێ دەگاتە دەستم، بچم بۆ شاییەک، حەز دەکەم، هەموو کچێک شوو بکا و هەموو کوڕێکیش ژن بێنێت، ئیشەڵا هەر واش دەبێت، کچ نامێنێ بێ مێرد و کوڕیش بێ ژن هەمووی شوو دەکا و ژن دەهێنێ، بەڵام بەخوا من حەزم لە ئاهەنگ نییە، من لە تەکیە و ناو دوعانووسیندا ژیاوم، نەخۆشێکیان دەهێنا منداڵێکە ترساوە قوڕقوشمێکمان لە سەر ئاگر دەتواندەوە و ئینجا دەمانکردە ناو ئاو و دووکەڵی دەکرد و ئینجا ئەو دووکەڵی قوڕقوشمە دەچوو بەسەر منداڵەکەدا و گوایە بەو دووکەڵە چاک دەبێتەوە، یان دوعای چاوەزار و چلەبڕ و دێوبەند و قاقەزباڵا و دوعای گەنجەلعەرش و گوللەنەبڕ و... هتد، من لەناو ئەمانەدا ژیاوم و گەورە بووم، بارودۆخێک کە لە ئەفسوونی داستانە کوردی و ئەوروپاییەکان دەچێت، وەکو ژیاننامەی خواوەندەکانی ئەسینا و ڕۆما، لەناو شایی و هەڵپەڕکێ گەورە نەبووم، بیرم نایەت شاییەک دووانم، لە کفریدا بینیبێت، چونکە منداڵیم لە کفری بەسەر بردووە، بە لاویش نەچووم بۆ هیچ شاییەک، تا ئێستا هەڵنەپەڕیوم و ناشزانم هەڵپەڕم.

* کاتێ لە ماڵەوە دادەنیشی لە ژوورەکەتدا دەنووسی، یان دەخوێنیتەوە، قەڵەم و وەرەقە و کتێب زۆر پەرت و بڵاو دەکەیت، بەناو ژوورەکەتدا؟

- جاری وا هەبووە میوانم هاتووە داوای لێبووردنم کردووە، چونکە ژوورەکەم لەمسەر بۆ ئەوسەر، دەیان قەڵەم و سەدان پارچە کاغەز و دەیان کتێبی تێدا پرژ و بڵاوبووتەوە و نەمتوانیوە کۆیان بکەمەوە، ئێستاش کە هاتمە دەرەوە بۆ ئەم چاوپێکەوتنە کە ئەمە چەند هەفتەیەکە لێرە لە ئوتێل ئاشتی دادەنیشین ئەم چاوپێکەوتنە دەکەین هەرچی قەڵەم و کاغەز هەیە لە ژوورەکەمدا پەرت و بڵاوم کردووتەوە و ناتوانم هەموو رۆژێ کۆیان بکەمەوە، چونکە ئێستا چەند بابەتێکم بە دەستەوەیە، بابەتێکم بە دەستەوەیە لەسەر شیعر و چیرۆک و ئەدەبی منداڵ، بابەتێکی ترم بەدەستەوەیە لەسەر توندوتیژی و ناتوندوتیژی کە هەر یەکەیانم لە کۆمەڵێ کاغەزدا نووسیوە، هەروەها زنجیرەیەکی تر دەنووسم لەسەر بیرەوەرییەکانم، کە هەژدە زنجیرەم لێ نووسیوە لە خۆرنەوەزان و دواتریش لە کۆواری لڤیندا بڵاوم کردەوە، ئێستا دەمەوێ چەند ئەڵقەیەکی تریش تەواو بکەم.

* ئەی بەچی تووڕە دەبیت؟ یان لەسەرچی لە کەسێک زویر دەبیت؟

- با پێت بڵێم لە سەدا نەوەد و نۆی ئەوانەی کە تووڕەن دڵیان پاکە، من یەکێکم لەوانەی کە زوو تووڕ دەبم، تووڕە نابم بە مانای تووڕەبوون، بەس خەم دەخۆم، سەیر دەکەی کەسێک ململانێیەکی گەورە دنێتەوە لەسەر شتێکی زۆر ئاسایی کە پێویست ناکات ئەو ململانێ گەورەیەی لێ بکەوێتەوە، تووڕە نابم نازانم بۆ؟ ئەگەر بگەڕێمەوە ماڵەوە هیچ حازر نەبێ تووڕە نابم، ئەگەر رۆژێ لە رۆژان شتێکم کڕیبێت مەعاشەکەمم پێ یابێت، لە دەستم بکەوێتە خوارەوە و بشکێ تووڕە نابم، دەڵێم شت هەر دەشکێ زۆرجار قسە لە بەرامبەرەکەشم قبووڵ دەکەم، ئاستی رۆشنبیریی بەرامبەرەکەم دەپێوم.

تووڕەبوون لای من شتێکی بەردەوام نییە، لە شتی نابەجێ و نابەهەق تووڕە دەبم، ئەگینا هەموو کات لەسەرخۆم، ئەوەتا چەند هەفتەیەکە ئەم چاوپێکەوتنە دەکەین، حاڵەتی تووڕەبوونم نەبووە و پشت بە خوا ناشبێت.

* یەعنی تۆ زۆر شت لە دڵ ناگری؟

– هەرگیز، یەعنی پێم سەیرە ئەگەر قسەیەکم بە نووسەرێک کردبێ یان بۆ نموونە رەخنەیەکم لێ گرتبێ لە دەقیکدا قەت لە بیری نەچووەتەوە، بەڵام من وا نیم.

* لە چ شتێکی خۆت نارازیت؟ لە هەڵسوکەوت و قسە و تەبیعەتت؟

– وەڵاهی دەتوانم بڵێم رووم خۆشە، هەندێ جار ئەگەر بزانم لە بەر هەر هۆیەک بێت لە سەدا سەد رووم خۆش نەبووە لەگەڵ کەسێکدا لە رێڕەوێکدا تووشم بووبێت و ئەو زۆر بەگەرمی بەپیرمەوە هاتبێت من ئیشێکم هەبووبێت، یان کەسێک بە تەلەفون ویستبێتی بمبینێ، یان شیعرێکی هەبووە و سەیری بکەم، لەوە پەشیمانم، دواتر وتوومە خۆزگە بمتوانیایە یارمەتیی بدەم. لە شتێک پەشیمانم کە بزانم چاک نییە.

* تۆ شیعری منداڵانت زۆر کراوە بە گۆرانی، ئەی شیعرەکانی ترت؟

– دوو شیعری خۆشەویستیی نیشتمانم کراوە بەگۆرانی کە هونەرمەند کاک خالید رەشید وتوویەتی، بەجوانترین گۆرانیی دەزانم کە تا ئێستا شیعری من کرابێت بە گۆرانی، شیعری منداڵانیشم ئای لەم بەفرە باریوە زۆر جوان کراوە و ئەو شیعرانەشم کە هونەرمەند، فوئاد مەولانایی کردوویەتی بە گۆرانی کە لە کوردسات پەخش دەکرێت، بەڕاستی بەوەرچەرخانێکی دەزانم لەو بوارەدا و کاک فوئاد دەورێکی باڵای بینیوە بەتایبەتی لە شیعری چۆلەکەی ژیر، پۆستەچی، باران، خۆزگە، لەم شیعرانەدا کە کردوونی بەگۆرانی بۆ منداڵ وەرچەرخانێکی گەورەی بەرپا کردووە لە گۆرانیی منداڵاندا.

## رەخنە

* قەت رەخنەت لە نووسینێک، یان دەقێکی خۆت گرتووە؟

– هەر شیعرێک دەنووسم و بڵاوی دەکەمەوە، دەیخوێنمەوە، دەڵێم دەبێ شتێکی جوانتر بنووسم، رەخنەم لە خۆم ئەوەیە، دەڵێم هێشتا ئەوە نییە کە دەمەوێت، ئەم بەیانییە شیعرێکم نووسیوە، ئەگەر بڵاوی بکەمەوە، دڵنیام دەڵێم ئەم شیعرەش ئەوە نییە کە خۆم دەمەوێ بینووسم، شیعری نەمر ئەوەیە کە هەتا دەمرین دەمانەوێ بینووسین.

* ئێستا لەناو رۆشنبیرانی کورددا کێن ئەوانەی بەبۆچوونی تۆ رەخنەگری ئەکادیمین و بەبێ لایەنی دەقێک هەڵدەسەنگێنن؟

– وەڵاهی ئەمە پرسیارێکی سەختە، من وا دەزانم ئێمە رەخنەگرێکمان نییە لە ئاستی رەخنەگرانی عێراقیدا بێت، ئەویش ناگەڕێتەوە بۆ تەمەڵیی رەخنەگری کورد، بگرە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی رەخنەگر بە بۆچوونی من، دەبێ سێ، چوار زمان بزانێ بۆ ئەوەی ئاگەداری رەخنەی هەموو جیهان بێت و ئاگەداری هەموو قوتابخانە شیعری و رەخنەییەکانی جیهان بێت، بەڵام رەخنەگری ئێمە زۆربەیان یەک زمان دەزانن، لەبەرئەوە، ناتوانن هاوتای رەخنەگرانی عێراقی و عەرەب و جیهان بن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا رەخنە و رەخنەگرمان هەیە و بوونی خۆیان سەلماندووە.

* تۆ وەکو شاعیرێک لە رەخنەگرانی ئێستای کورد رازیت؟

– باسمان کرد، من ویستم بە کورتی بیبڕمەوە و خۆم لە شەڕی رەخنەگران لادەم، بەڵام وا دیارە دەتەوێ شەڕ بۆ خۆم بدۆزمەوە، من بە دڵنیاییەوە دەیڵێم، ئێمە رەخنەگرێکمان نییە لە ئاستی رەخنەگری جیهانیدا بێت، یەکێک لە هۆکارەکانی ئەوەی کە ئێستا دەقی باش و خراپ هەڵاوێر نەکراوە و تێکەڵ و پێکەڵ بووە و شاعیرێکی دەرەجە یەک و شاعیرێکی دەرەجە سفر، وەکو

یەک تەماشا دەکرێن و هەر دەڵێن ئەمە شاعیرە، ئەوە تاوانێکە لە ئەستۆی رەخنەگردایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە ناتوانین بڵێین رەخنەگرمان هەر نییە، دەتوانم چەند ناوێک بڵێم کە رەخنەگری باشن و شتی باش و خراپیشیان لەسەر من نووسیوە و باش و خراپەکەشیانم پێ خۆشە لەوانە: کاک عەتا قەرەداغی و کاک عەبدوڵا تاهیر بەرزنجی و د. عەلی تاهیر بەرزنجی و کەمال میراودەلی و کەمال غەمبار و محەمەد کوردۆ و زاهیر رۆژبەیانی، ئەمانە ئەو ناوانەن کە قەت پەشیمان نەبم، بڵێم لە زۆربەی رەخنەگرتنەکانیاندا لە دەقەکان مافی دەقە ئەدەبییەکانیان داوە، پێشتریش لە حەفتاکانیشدا ناوگەلێکی باش هەبوون، فوئاد قەرەداغی و کاک فازیلی مەلا مەحموود و کاک فوئاد میسری لە حەفتاکاندا، دەورێکی بالایان بینیوە، بەڵام ئێستا وا بزانم لەو بوارە دوورکەوتوونەتەوە، کەسانی تریش هەن رەنگە پێ بگەن و رەنگە پێ نەگەن، ئەو ناوانەشی بیرم نییە، داوای لێبووردنیان لێ دەکەم.

* رووی داوە بەرەخنەگرتن غەدریان لێ کردبێتی و لە بەرزیی دەقەکەتیان کەم کردبێتەوە؟

– بەڵێ، زۆرجار هەست بەوە دەکەم رەخنەگر نەیتوانیوە جوانییەکانی دەقە شعرییەکەم پێشانی خوێنەری کورد بدا، هەندێ شیعرم کە بە کوردی نووسیومن لەیەن رەخنەگرانەوە پشتگوێ خراون، کاتێک کە کراون بە عەرەبی رەخنەگری باشی عەرەب جوانترین رەخنەیان لەسەر نووسیوە و بە دەقێکی هاوچەرخانەی نوێی وایان داناوە، کە هەموو خەسڵەتێکی نوێگەریی شیعری جیهانی تیابێت، بەڵام بە کوردی دێرێکیشی لەسەر نەنووسراوە.

* لەو ژیانەی تا ئێستا رات بواردووە رازیت؟

– رازی چییە؟ وەکو خۆم کە ژیاوم لە هەڵسوکەوت و کردار و نووسینەکانی خۆم رازیم، بەڵام کێشەی من ئەوە نییە من لە ژیانی خۆم رازیم، یان نا،

کێشەی من کێشەیەکی گەورەیە، مرۆڤ لەوەتەی هەیە بە دوای ئەو کێشەیەدا ماندوو بووە، کێشەی من نەمرییە، گەلگامیش بە دوای نەمریدا دەگەڕا و ویستی ئاوی ژیان، یان گیای ژیان بدۆزێتەوە نەیتوانی، دواتر لەو دەقەدا بەنەمری مایەوە کە کراوە بە داستانی گەلگامیش و لەگەڵ ئەنکیدوّدا، چوون بۆ کوشتنی خەمبابا کە گیانلەبەرێکی زۆر گەورە بووە و ژیانی لە خەڵک تاڵ کردووە، گەلگامیش بەو کردارە چاکەی کە خەمبابای کوشتوە، بەوە نەمریی بۆ خۆی پەیدا کرد، هەرچەندێ خەمبابا نەکوژراوە، ئێستا لە هەموو شەقامەکان و بازاڕەکان و داوودەزگاکاندا هەیە، خەمبابا هەر ماوە ئەگەر ئەوسا یەکێک بووبێ، ئێستا بەهەزاران خەمبابامان تووش دەبێ لە هەموو شوێنێکدا و ئەگەر باوەڕ ناکەن یاخوا ئیشێکتان بکەوێتە دائیرەیەک لە دائیرەکانی حکوومەتی هەرێمی کوردستان، جا بزانن خەمبابا ماوە، یان مردووە.

هەروەها کێشەیەکی تریش هەیە، کێشەی ئازادی، زۆرجار باسی ئازادی کراوە، کە کۆماری ئەفلاتوون دەخوێنیتەوە، مرۆڤی دابەش کردووە بەسەر چەند چینێکدا، چینی گەورە و چینی ژێردەستە و چینی ناوەند و دەیان چینی تریش هەن هەر کۆیلەن هەر دەبێ کۆیلە بن و نابێ قەت ئازاد بن، ئەمە لە ئەسینادا کە بە وڵاتی دیموکراسییەت ناوی دەرکردووە و بەوڵاتی ئازادی ناوی دەرکردووە چینێک هەبووە هەر دەبوو کۆیلە بن، هەر کەسێک لەبارەی یەکسانییەوە قسەی کردبێت وەکو سوقرات دەرمانخوارد کراوە و بەزۆر پێکی ژەهراویان داوەتێ، یان وەکو شیشیرۆن زمانیان بڕیوە و نابێ باسی ئازادیی ڕەهای مرۆڤایەتی بکا، ئێستاش کێشەی من کێشەی ئازادییە، من وا هەست ناکەم مرۆڤ بەدرێژایی مێژوو، هەرگیز ڕۆژێ لە ڕۆژان ئازاد بووبێ، بۆ نموونە کاتێک بەهێز و بێهێز هەبووە، بێهێز ژێردەستەی بەهێزەکان بووە، کاتێک ئاینەکان هاتنە کایەوە و سەریان گرت ئایندارەکان بەزۆری شمشێر خەڵکی بێ ئاینیان دەخستە بازنەی ئاینەوە و بەزۆر بیروڕایەکیان بە سەرا دەسەپاند کە بەدڵی نییە، کەواتە ئا لێرەوە ئیتر ئازادیی مرۆڤ تەواو، چونکە

ئازادیی ئاینی نییە، کە ئازادیی ئاینی نەبوو، ئازادیی بیروڕای نییە، بە ناوی خواوە کەسانێک لێ نەگەڕاون خەڵک ئازادیی بیروڕا و ئازادیی ئاینیی هەبێ، بەبێ دوودڵی دەیڵێم کە ئازادی ئاینی نەبوو، ئازادیی بیروڕا نییە، کاتێک کە لەشکری هەر ئاینێک رووی لە وڵاتێک کردووە، بەزەبری شمشێر وڵاتەکەی خستووەتە ژێر دەستی خۆی و ئاینەکەی بە سەردا سەپاندوون، بێگومان لەو حاڵەتەدا ئازادیی مرۆڤ پێشێل کراوە، کاتێک کە ئەمەوییەکان بە ناوی خواوە ئیسپانیایان گرت، ئازادیی مرۆڤیان پێشێل کرد، بۆچی؟ لەبەرئەوەی ئیسپانیا وڵاتێکی مەسیحی بوو، بەڵام بەزەبری شمشێر ئیسلامیان بەسەردا سەپاند، کاتێکیش کە هەڵگەڕانەوە بوو... هتد. مەسیحییەکان توانایان پەیدا کرد، ماڵ بەماڵ دەگەڕان بەزۆر هەر موسڵمانێک نەبووایە بە مەسیحی سەریان دەبڕی و دەیانکوشت، ئەوەش دووبارە هەر راکێشانی بەرەی ئازادیی ئاین و بیروڕا بوو لەژێر پێی مرۆڤێک کە لەوەتەی هەیە، بۆ ئازادی دەگەڕێ، ئازادی لای من گرینگترین شتە لێ گەڕێن مرۆڤ ئازاد بێت.

* ئەوە سیستەمی ژیانە کە هەمیشە چینێک بچەوسێنێتەوە، یان هەموو کات وڵاتێک وڵاتێکی تر داگیر بکات و بیچەوسێنێتەوە و ئازادییەکانی لێ زەوت بکا، یان ئەوە ئارەزووی مرۆڤ خۆیەتی هەردەم کۆمەڵێک ژێردەستەی کۆمەڵێکی تر بێت؟

- من نازانم گوایە دەڵێن هۆکاری ئەمە (من باوەڕ بەوە ناکەم) هۆکاری ئابوورییە، من هۆکارێکی ئابووری لەوەدا بەدی ناکەم، مرۆڤ ببێ بەژێردەستەی مرۆڤ، چونکە زۆربەی دیلەکانی جاران کە هەندێکیان زۆریش دەوڵەمەند بوو لە شەڕێکدا دەگیران و دەیانکردن بەکۆیلە، ئەمە چ هۆکارێکی ئابووریی لە پشتەوەیە؟ خۆ ئەو خۆی دەوڵەمەند بوو، یان سەیر دەکەی یەکێک ئاینی نەبووە هاتووەتە بازنەی ئاینێکەوە هەتا دەمرێ ملکەچی ئەو ئاینەیە، هەرچی ئەو ئاینە لێی قەدەخە بکا ناتوانێت بیکات، ئەوەشی ئەو ئاینە پێی رەوا ببینێ دەیکات، ئەمە دووبارە خۆی لە خۆیدا جۆرێکە لە دیلێتی، حزبی

نەبووە دەچێتە ناو حزبێکەوە، هەر شتێ حزب پێی خۆش بێت و لە بەرژەوەندی حزب بێت، بەسەر ئەو کەسەدا دەچەسپێ کە چووەتە ناو ئەو حزبەوە، هەرچیش لەبەر بەرژەوەندی ئەندامی حزبەکە بێت، بەمەرجێک بەرژەوەندی حزبی تیا نەبێت، یان زەرەر لە حزبەکە بدا نایەڵن ئەو کەسە بیکات، ئەمە زەوتکردنی ئازادیی مرۆڤە لەلایەن ئاین و حزب و هەندێک جار سیستەمێک لە سیستەمەکانیشەوە، دەوڵەتێک شەڕێکی گەورە لەگەڵ دەڵەتێکی تردا دەکات، خەڵکی ئەو وڵاتە بە زۆر پەلکێشی ناو شەڕ دەکات، لە خۆڕا بەکوشتیان دەدات لە پێناوی خواستێکی گلاوی خۆیدا، ئەمە هەمووی زەوتکردنی ئازادیی مرۆڤە، من وا هەست دەکەم مرۆڤ لەوەتی هەیە بۆ ئازادی دەگەڕێ، بەڵام تا ئێستا نە مرۆڤێک ئازاد بووە و نە مرۆڤێکیش ئازاد دەبێت، تا دنیا کۆتاییی دێت مرۆڤ بە ئازادی ناژی، هەموو کات شتێک هەیە بیکات بە ژێردەستە و جۆرێک لە جۆرەکانی کۆیلەیی بەسەردا بسەپێنێت، توخوا لێتان دەپرسم، کاتێک کارێکتان دەکەوێتە هەر داوودەزگایەک کەمتەر خەمیی زۆربەی کارمەندان لەبارەی تەواوکردنی کارەکەتەوە، وات لێ ناکات، هەست بەکۆیلەیی بکەیت؟

## ئازادی

* لە شیعرەکانتدا گەڕان بە دوای ئازادیدا رەنگ یداوەتەوە؟

– دەبێ رەنگی دابێتەوە، من هەمیشە لە شیعرەکانمدا بە دوای ئازادیدا گەڕاوم، بەڵام وا هەست ناکەم دەسەبەر بووبێ، لە میسرییەکانەوە بیگرە ئەو ئەهرامە گەورانە بەپشتی کۆیلە کراوە و بە ئارەقی ماندووبوونی کۆیلە بەرزبووەتەوە و هەر کەسێکیشیان مردبێت، تەرمەکەی تێکەڵاوی ئەو داروبەردە کراوە کە کراوە بەو ئەهرامانە و بایەخێکی ئەوتۆی بۆ نەماوەتەوە، ئێستا خەڵک ناوی ئەو پاشا و فیرعەونانە دەزانێ کە لە سەردەمی ئەواندا ئەو ئەهرامانە کراوە، بەڵام ناوی یەک کرێکار لەو کرێکارانە نازانرێت کە ئەو

ئەهرامانەیان دروست کردووە، ئەمە کۆیلەیی نەبێ، چییە؟

* کەواتە هەموو شتە باشەکان لە سیستەمی زۆرداریدا بۆ کەسە دەسەڵاتدارو گەورەکان دەگەڕێتەوە؟ وەکو ئەوەی باست کرد.

– بەڵێ ناوەکەی بۆ فیرعەونەکانە و ماندووبوونەکەشی بۆ چینێکی چەوساوەیە بۆ کۆیلەکانە، هەموو دەوڵەت و ئاین و حزبێک بانگەشەی ئازادی دەکات، دواتر کە بوو بە خاوەنی هێز هەموو ئازادییەکی مرۆڤ پێشێل دەکات، ئایەتێک هەیە لە قورئانی پیرۆزدا زۆرم پێ خۆشە، خوای گەورە دەفەرموێ (لا إكراه في الدين) واتە مرۆڤ ئازادە چ ئاینێک هەڵدەبژێرێ، کەواتە مادەم (لا إكراه في دين)ە، دەتوانین بڵێین (لا إكراه في رأي، لا إكراه في تحزب)، (لا إكراه في إختيار نمط الحياة)، کەواتە مادەم لە دینداریدا مرۆڤ ئازادە، لە بیروڕاشدا خوا ئازادی کردووە، لەوەشدا کە جۆری ژیانی خۆی هەڵبژێرێ ئازادە، بەڵام سیستەمەکان ئەو ئازادییە لە مرۆڤ زەوت دەکەن، نەک خوای گەورە.

* لە کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت نازانیت و بەکاریان ناهێنیت، لە کاتێکدا خۆت هەموو کات حەزت لە نوێگەری و شتی تازەیە، ئەمەش داهێنانێکی نوێیە و دەبێت لەگەڵ تۆدا بگونجێ، بۆچی لێی نازانی و بەکاری ناهێنی؟

– من ناڵێم شتێکە لێی تێ ناگەم و موعجیزەیە، وەڵا رەنگە بە نیو سەعات فێری کۆمپیوتەر بم باوەڕ ناکەم لە موبایل گرانتر بێت، کاتێک کە موبایلم کڕی سەرەتا نەمدەتوانی قسەشی پێ بکەم، بەڵام ئێستا رەنگە بتوانم بیکەمەوە و چاکیشی بکەمەوە و، سەرەتا پێم سەیر بوو کەسێک نامەی بۆ دەهات و دەیخوێندەوە، ئێستا دەتوانم دەیان نامە وەربگرم و دەیان نامەش بنووسم، کۆمپیوتەریش هەر لەو بابەتەیە، بەڵام کاتم دەبات، من حەز دەکەم زیاتر کاتەکانی خۆم بە خوێندنەوەوە بەرمە سەر، لە بیریشت نەچێ من ئەگەر

کۆمپیوتەرم هەبێت دەبێت ئینتەرنێتیشم هەبێت، کە ئینتەرنێتم بوو، ئەزانی چی؟ ئەوسا دەبێ ئیمێڵیشم هەبێ ئیتر دەبێ هیچ ئیشم نەبێت، وەڵامی ئیمێڵی برادەرانی دەرەوە و نووسەران بدەمەوە، چونکە من کە ئینتەرنێتم بەکار هێنا، حەتمەن دەقەکانی خۆم بە ئینتەرنێت بڵاو دەکەمەوە جا من کاتی ئەو هەموو وەڵامدانەوەیەم نابێت... هتد. بە چیە پێت دەڵێم، کۆمپیوتەری جانتاییم هەیە.

## ئینتەرنێت

* ئەوە باسی بڵاوکردنەوەی بەرهەمت کرد، لە ئینتەرنێتدا، چەند گەڕاوم بەرهەمت مەگەر پارچە پارچە نووسین، یان شیعرت لە ئینتەرنێتدا هەبێت، بەکتێب هیچ بەرهەمێکت بڵاو نەبووتەوە لە ئینتەرنێتدا بۆچی؟

- نەوەڵا هیچ کتێبێکم لە ئینتەرنێتدا بڵاو نەبووەتەوە ئەوە ئیهمالی خۆمە، وەکو وتم، کاتم کەمە، کاتەکانم زیاتر بۆ خوێندنەوە و نووسین تەرخان کردووە، کتێبەکانم چاپ کردووە بە کوردی بە عەرەبی ئەگەر بە ئینتەرنێتیش نەگات بە خەڵک بە کتێب دەگات بەخەڵک، لە گەڵێ رۆژنامە و کۆواریشدا بابەت بڵاو دەکەمەوە بە عەرەبی و کوردی، ئەوانە زۆریان دەچنە ئینتەرنێتەوە کە لەو کۆوار و رۆژنامانەدا بڵاویان دەکەمەوە، بەڵام ئەوانەی بە کتێب بڵاوم کردووەتەوە هەر چەندە هەندێ برادەریش، بەتایبەتی کاک محەمەد کوردۆ، چەند جارێک داوای لێ کردووم وتوویەتی بیهێنە من دەتوانم بیخەمە ئینتەرنێتەوە، بەڵام لەبەر کەمتەرخەمیی خۆم نەمبردووە.

* تۆ بێجگە زمانی کوردی عەرەبییەکی باشیش دەزانی و بە زمانی عەرەبیش نووسینت زۆرە چ شیعر، چ نووسین، چ کتێب، حەز دەکەم باسی ئەوەم بۆ بکەیت تا چەند ئەو نووسینە عەرەبییانەت هۆکارێک بوون بۆ ئەوەی لەتیف هەڵمەت لە دەرەوەی کورددا

بناسرێ؟

– له سەدا سەد نووسینه عەرەبییەکانم وای کردووه من له دەرەوه بناسرێم، هەر بۆ نموونه نووسینه عەرەبییەکانم، یان ئەو نووسین و شیعره کوردییانەم که کراون بەعەرەبی که خۆم، یان عەرەبیزانێک کردوونی به عەرەبی وای کردووه رەخنەگرێکی گەورەی وەکو دوکتۆر حاتەمولسوگەر سێ وتاری رەخنەیی و لێکۆڵینەوه لەسەر شیعرەکانم بنووسێ، هەروەها زۆربەی رەخنەگرانی عەرەبی عێراق دەتوانم بڵێم ده کەسیان لەسەر شیعرەکانم بنووسن، کاتێک که هەندێ بەرهەمم کراون به فارسی، گەلێ نووسەری فارس لەوانه: سەید عەلی ساڵحی شتیان لەسەر شیعرەکانم نووسیوه، هەر ئەو نووسینه عەرەبییانەمه وای کردووه شاعیرێکی عەرەب له دانیمارکەوه دیوانێکی خۆیم بۆ بنێرێ که شاعیرێکی ناسراوه لەناو عەرەبدا، زۆر نوێگەره، بەرهەمەکانی کراون به ئینگلیزی به دانیمارکی ناوی عەبدول مونعم ئەلفەقیره، له دانیمارکەوه دیوانێکی خۆی بۆ ناردووم کاتێک که هاتبوو بۆ بەسره هەواڵی پرسیبووم به رێکەوت کاک ئاوات حەسەن ئەمین لەوێ بووه، بەکاک ئاواتدا ئەو دیوانەی خۆی بۆ ناردووم، وەکو کاک ئاوات وتی، وتوویەتی دەعوەتیشی دەکەم بۆ دانیمارک ئەمه له رێگەی شیعرەکانمەوەیه، هەر له رێگەی شیعرەکانمەوەیه شاعیرێکی کوردی عەرەبینووس، تەها خەلیل، شاعیرێکی زۆر ناسراوه له سووریا کورده و بەعەرەبی دەنووسێ له سووریاوه نامەم بۆ بنێرێ پیرۆزبایی شیعرەکانم لێ بکا.

ئەوەشم له بیر نەچێت که هەر ئەو شیعره عەرەبییانەمه وای له شاعیرێک و نووسەرێک و رۆژنامەنووسێکی ناسراوی وەکو ئەمەل جبووری کرد که کۆمەڵێ هۆنراوەم له زمانی عەرەبییەوه بکا به زمانی ئەڵمانی و پێشەکییەکی جوانی بۆ بنووسێ و له کۆواری دیوانی شیعری عەرەبی– ئەڵمانیدا بڵاوی بکاتەوه، ئەگەر شیعرم به عەرەبی بڵاو نەبووایەتەوه کەسێکی وەکو ئەمەل جبووری که شاعیر رۆژنامەنووسێکی ناسراوه نەدەهات ئەو شیعرانەم بکا به ئەڵمانی و بڵاوی بکاتەوه، رەنگه ئەمەی بۆ منی کردووه باوەڕ ناکەم بۆ

شاعیرێکی تری کورد کرابێت، من شانازیی پێوه دەکەم کە ژنە شاعیرێکی عەرەب کۆمەڵێ شیعرم لە عەرەبییەوە بکا بە ئەڵمانی، ئەمە سەرکەوتنێکە لە پێشدا بۆ شیعری کوردی، ئینجا بۆ من، هەستی شاعیرانەی ئەمەل جبووری ئەوەندە ناسک و بەرزە، ئەگەر شیعرەکانم لەو ئاستەدا نەبێ بیکات بە ئەڵمانی، نەیدەکرد.

## مەحمود دەرویش

* تۆ نێزیکەی چل کتێبت هەیە، بەدیوانی شیعری و ئەدەبی منداڵان و نووسین و... هتد. چەند بەرهەمێکت هەر بە زمانی عەرەبی نووسراوە، یەکێک لەوانە کلیۆپاترایە، پێم خۆشە باسی ئەوەم بۆ بکەیت تا چەند لەناو جیهانی عەرەبیدا دەنگی داوەتەوە و پێشوازیی لێ کراوە؟

- شتێک من و کلیۆپاترا لە یەکتر نێزیک دەکاتەوە، کلیۆپاترا زۆر لە پیرێتی ترساوە، حەزی کردووە هەر تەمەنی گەنج بێت، لەبەرئەوە دەڵێن حەوزێکی لە شووشە دروست کردووە، ڕۆژانە پڕی کردووە لە شیری مەڕ و مانگا و لەناو ئەو حەوزی شیرەدا، مەلەی کردووە، چونکە شیر پێستی مرۆڤ نەرم و جوان دەکات و نایەڵێت زوو ڕەنگی پیریی لێ بنیشێ، منیش حەز دەکەم دەرمانێک بدۆزمەوە نەهێڵێ مرۆڤ پیر بێت، جارێک خوێندکارێکی زانکۆ پێوەندیی پێوە کردم پیرۆزباییی شیعرێکی لێ کردم، پێم وت لە چ بەشێکی، وتی لە بەشی بایۆلۆجی پێم وت نەتبیستووە لە سەرچاوەیەکدا دەرمانێک هەبێت مەنعی پیری بکا، بەو شێوەیە چۆن کلیۆپاترا بە دوای هەردەم گەنجێتیدا گەڕاوە، منیش حەز دەکەم هەموو کات گەنج بم، ئەو خاڵە وای لێ کردم ناوی کلیۆپاترا بکەم بەناوونیشانی ئەو دیوانە شیعرییە.

کاک ئاوات حەسەن ئەمین لە سەفەرێکیدا کە چوو بۆ ئەردەن، پێی وتم چەند دیوانێکتم بەرێ دەیبەم بۆ شاعیرانی ئەوێ، خۆی گێڕایەوە وتی، لای

بەیانی بوو دیوانەکەمی (شیخوخة کلیوباترا و أطفال المطر) لەگەڵ دیوانێکی خۆیدا دابوو بە مەحموود دەروێش، گێڕایەوە وتی، بۆ بەیانیی دواتر کە هاتەوە مەحموود دەروێش دیوانەکەی تۆی بە دەستەوە بوو وتی، ئاوات ئەمە شاعیرێکی ئاسایی نییە، نەدەبوو دیوانەکەی بەم چاپە خراپە چاپ بکرێت، ئەمە قسەی مەحموود دەروێش بووە و بۆچوونی لەبارەی (شیخوخة کلیوباترا و اطفال المطر). چەند کەسێکیش بە باشی لە سەریان نووسیوە لەوانە: لوقمان مەحموود و حەسبوڵا یەحیا.

* ئەی تۆ مەحموود دەروێشت دەناسی؟

- من لەوەتەی شیعر دەخوێنمەوە، شیعری مەحموود دەروێش دەخوێنمەوە و یەکەم دیوانە شیعری کە خوێندمەوە (عاشق من فلسطین) بوو، لەو ساوە تا ئێستاش هەر پێشانگەیەک دەکرێتەوە من دیوانەکانی مەحموود دەروێش دەکرم، ئێمە و برایانی فەڵەستین زۆر شت لەیەکمان نێزیک دەکاتەوە و هەست و سۆزی شاعیرانە و مرۆڤانەمان وەکو یەکە، لەبەرئەوە من پێم خۆشە شیعری شاعیرانی فەڵەستین بخوێنمەوە، وەکو مەحموود دەروێش، سەمیح لقاسم، تۆفیق زیاد، سالم جەبران، مەعین بەسیسۆ، ئەمانە شاعیرگەلێکن هەر لە سەرەتاوە ناسیومن و بابەتەکانیانم خوێندووەتەوە و خۆشحاڵیش بووم لەم رۆژانەدا لە پێشانگەکەی ئەمساڵ ۲۰۰۹ ی مەدادا کە لە سلێمانی کرایەوە، دیوانی مەعین بەسیسۆم کڕی، کاتی خۆی ناوبەناو، دیوانیم لێرە و لەوێ خوێندبووەوە، بەڵام کۆی گشتی بەرهەکانیم نەخوێندبووەوە، خوێندنەوەی شیعری شاعیرەکانی فەڵەستینم پێ خۆشە.

* دەوترێ مەحموود دەروێش لە کوردەوە نێزیکە، لە کاتێکدا وەکو سۆزێک شیعرێکی بۆ کورد نووسیوە لە چاپی دووەمی دیوانەکەیدا ئەو شیعرەی لابردووە.

- مەحموود دەروێش لای نەبردووە، ئەو خانەی بڵاوکردنەوانە لایان بردووە کە

دیوانەکەیان چاپ کردووە، وا دەزانم لە دیوانێکی مەحموود دەروێشدا کە خۆی چاپی کردووە و لە دیمەشق جیا نەکراوە و وا بزانم لە ئوردن، یان لە لبنان چاپ کراوە، لەو دیوانەیدا ئەو شیعرەی تێدایە کە بۆ کوردی وتووە (الموت للاکراد) شتێکی وایە ئەو شیعرە یەکجار لە حەفتاکاندا خوێندوومەتەوە، نەک هەر ئەو لە فەڵەستین و لبنانیش شاعیر هەن کە شیعریان بۆ کورد وتووە، هەر بۆ نموونە (یوسف الخال) لە شیعرێکدا باسی کورد دەکات کە شاعیرێکی لبنانییە و موسڵمانیش نییە، مەسیحییە، شیعرەکە لە کۆی بەرهەمە شیعرییەکانیدایە.

## شاعیر و رۆشنبیر

* پێوەندیی شاعیر و رۆشنبیر چییە؟ دەبێ شاعیر رۆشنبیر بێت؟

- بەڕاستی شاعیر رۆشنبیر نەبێ، شاعیر نییە، شاعیر دەبێ هەموو تەوژمەکانی رۆشنبیریی هەزم کردبێت، نابێت شاعیر شیعر بنووسێ و ئاگەداری شیعری ئەوروپی، تورکی، فارسی، رووسی و شیعری زمانەکان تر نەبێت، من ناڵێم ئەو زمانانە بزانێ، بەڵام دەبێ لە رێگەی وەرگێڕانەوە هەموو ئەوانە بزانێ.

جاران شاعیرێک کە شیعرێکی دەنووسی، بۆ خۆی دەنووسی، من زۆربەی ئەو شیعرانەم بەدڵ نییە، هەر ئەوەش بوو وای لێ کردم سەرەتا شیعری کوردی زۆر نەخوێنمەوە، چونکە گەلێ لەو شیعرانە کاڵوکرچن، باسی نالی و مەحوی و سالم و کوردی و مەولەوی و ئەو شاعیرانە ناکەم، بەڵام گەلێ دەقی تر هەن کە کرچوکاڵییان پێوە دیار بووە، واش نەزانین شاعیرانی کورد رۆشنبیر نەبوون، یان نالی رۆشنبیر نەبووە، نالی لە هەموو شیعری فارسی و عەرەبی شارەزا بووە، هەروەها ئەوانی تریش رۆشنبیرییەکی روحییان بووە و فارسی و عەربیی باشیان زانیوە، لەبەرئەوە، شیعرەکانیان نەمرە، سەیر کە شیعرەکانی تایەر بەگی جاف، رۆشنبیرییەکی کۆمەڵایەتییان تێدایە، هەروەها

ئەحمەد موختاری برای شیعرەکانی رۆشنبیرییەکی سیاسی و کۆمەلایەتی و یاخیبوونیان تێدایە، لەبەرئەوە هەموویان رۆشنبیر بوون و شیعرەکانیان نەمرە، بەلام ئێستا شاعیری وا هەیە وا دەزانێ کە پلە بەرزەکانی شیعر ئەوەیە بەردەوام شیعر بنووسێ، بەلام کە دەچیتە مالەکەی کتێبخانەیەکی نییە، سەیری ژیانی رۆژانەی دەکەیت، کتێبێک، یان رۆژنامەیەکی نەخوێندووەتەوە، بەڕاستی شیعری هەندێک برادەر هیچ رۆشنبیرییەکی پێوە دیار نییە لە هیچ بوارێکی ژیاندا، نە رۆشنبیرییەکی روحی نە رۆشنبیرییەکی کۆمەلایەتی نە رۆشنبیرییەکی سیاسی نە رۆشنبیرییەکی مێژوویی و بوارەکانی هونەری بە شیعرەکەیەوە دیار نییە، لەبەرئەوە دەچێتە خانەی وشە ریزکردنەوە و پێم گوناهە زۆرجار لە رۆژنامەیەکدا، یان لە کۆوارێکدا دەیان شیعر بلاو بووەتەوە، بەلام وشە ریزکردنە و بەناوی شیعرەوە بلاو بووەتەوە، جێی داخە جاری وا هەیە دە شیعر لە شوێنێکدا بلاو بووەتەوە ئەگەر ناوی شاعیرەکان لابەیت و لە سەرەتاوە تاکۆتایی هەمووی بخوێنیتەوە لەیەک دەچێ و وشە ریزکردنە و هیچ جۆرە رۆشنبیرییەکی پێوە دیار نییە، ئەمەش جێگەی نیگەرانییە بۆ شیعری کوردی، حەق وایە رۆژنامە و کۆوارەکان بە خۆیاندا بچنەوە، چونکە نابێت چەند شیعرێک لە کۆوارێکدا بلاو ببێتەوە و هەمووی لەیەک بچێت، ئەمە بارێکی گرانە بە سەر شیعری کوردییەوە و پێویستە رەخنەگران بێنە قسە و شیعری باش و خراپ هەلاوێر بکەن.

## کەرکووک

* با لەبارەی کەرکووک پرسیارێکت لێ بکەم، دەبینین ئێستا کەرکووکییەکان بە دەست دەیان کێشەوە دەنالێن، هەست بەچی دەکەی کەرکووکییەکان لەو دۆخەدا دەژین، یان تۆ هیچت هەیە بۆ ئێستای کەرکووک؟

– من کاتی خۆی لە سەردەمی رێژیمدا، شیعرێکم نووسیوە لە گەردەلوولی

سپیدا بڵاوم کردووەتەوە، شیعری (گوڵ) بۆ کەرکووکە و جوگرافیای کەرکووکم تیا خستووەتە روو، لەو شیعرەدا کە لەو سەردەمەدا نووسیومە، خەڵکی کەرکووکیان بەزۆر تەرحیل دەکرد، من ناوەڕۆکی شیعرەکەم ئەوەیە هەمووماڵێک گۆڕی خۆی لەبەر دەرگەکەی خۆیدا هەڵکەنێت و ئێسکی خۆی بکا بە تیر و کەوان شەڕی پێ بکا، بەڵام کەرکووک چۆڵ نەکات، ئێستا وەکو لە بیرم بێت لە دوای پرۆسەی ئازادیی عێراقەوە، چەند جارێک لە تەلەڤزیۆنی کەرکووکەوە داوام لێ کرا، شیعرێک بنووسم بۆ کەرکووک، من شیعرم زۆرە بۆ کەرکووک، بەڵام بە روون و رەوانی نا وەکو سروود، من نەمتوانی ئەو سرووده بنووسم تا شەش حەت مانگێک پێش ئێستا، چەند مانگێک پێش ئێستا هەر لە خۆمەوە حاڵەتێک هات بەسەرما و دانیشتم ئەو سروودەم نووسی بۆ کەرکووک، ناردوومە بۆ کۆواری گزنگ لەوێ بڵاو ببێتەوە، هیوادارم بڵاو ببێتەوە و بکەوێتە بەرچاو، ئەو شیعرەم لە دوای پرۆسەی ئازادیی عێراق نووسیومە و دڵنیام ئەو برادەرانەی داوای سروودیان لێ دەکردم ئەو شیعرە ببینن ئاوازی بۆ دادەنێن و دەیکەن بە سروود.

## سروودی نیشتمانی

* ماوەیەک پێش ئێستا مشتومڕی ئەوە هەبوو کە سروود و مارشی نەتەوەیی (ئەی رەقیب) بگۆڕێت و شیعرێکی تر بکەن بە سروودی نەتەوەیی کە لەگەڵ وەزعی سیاسی و کۆمەڵایەتیی ئێستادا بگونجێت، تۆ لەسەر ئەوە بۆچوونت چییە؟

– ئەگەر هۆی ئەوە بێت کە دەڵێ، دینمان ئاینمان هەر نیشتمان، وەڵایی منیش هەزار بارەی دەکەمەوە دینمان ئاینمان هەر نیشتمان، ئەگەر نیشتمانم نەبێت نەدینم دەبێت نەئاین، ئەگەر لەبەر ئەو هۆکارە لا دەبرێ، کوفرە لاببرێ دەبێ نیشتمان هەردەم دین و ئاینمان بێت، ئەوەی نیشتمانی نەبێت خوا و ئاینیشی نییە، ئێمە لە پێشا نیشتمانمان دەبێت، ئینجا خواو ئاینمان دەبێت،

لەبەرئەوە من نالێم ئەو سرووده بگۆڕێت، شتێک نییە تازە بگۆڕێت، ناکرێت گوێژە بگوێزینەوە بۆ قەندیل و قەندیل بگوێزینەوە شوێنی گوێژە، بەڵام ئێمە قەندیل و گوێژە و بەرانان و هەیبەت سوڵتان و هەڵگوردمان هەیە قەی چێ دەکات با چەند سروودێکیشمان هەبێت، واتە لە پاڵ (ئەی رەقیب)دا با چەند سروودێکی ترمان هەبێت ئاساییە، بۆ مەسەلەی ئەوەی ئەمە لەرێ دەرچوونە و خوا پێی ناخۆشە ئەسڵەن ئەمە قسەیەکی دروست کراوە، چونکە لە شەڕی ئوحددا کاتێ موسڵمانەکان خەریک بوو تێک دەشکان حەسانی کوڕی سابت بە شیعر، جوێنی بە قورەیش و گومڕاکان و خوانەناسان دەدا، پێغەمبەر بە حەسانی گوت "ئەی حەسان دایک و باوکم بەقوربانت بێت، جوێنیان بەرێ بە شیعر" تەها حوسێن دەڵێ، ئەوە یەکەم جارە پێغەمبەر(د.خ) بە یەکێ بڵێ، دایک و باوکم بەقوربانت بێت، هەروەها دەڵێ ئەو جوێنانەی حەسانی کوڕی سابت بە شیعر بە موشریکینی دەدا، لە رووم نایە بیخەمە سەرکاغەز، ئەوەندە جوێنی روون و رووتی تێدایە، واتە جوێنی بازاڕین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر(د.خ) پیرۆزبایی لە حەسان کردووە و وتوویەتی دایک و باوکم بەقوربانت بێت، کەواتە هیچ وشەیەک نییە، قەدەخە بێت خوا کە زمانی داوە بە ئێمە، پێی بدوێین هیچ وشەیەک قەدەخە نییە، بۆمان هەیە بە هەموو وشەیەک بدوێین، پێغەمبەر (د.خ) دەفەرمووێ (حب الوطن من الإيمان).

* کەواتە تۆ لەگەڵ ئەوە نیت (ئەی رەقیب) بگۆڕێت بۆ سروودێکی تری نیشتمانی؟

– ئەگەر خوانەناسین کوفر بێت، لابردن و گۆڕینی سروودی (ئەی رەقیب)یش جۆرێکە لە جۆرەکانی کوفری نیشتمانپەروەری.

## لە چاپدان و هەڵەی چاپ

* با بێینە سەر چاپکردنی بەرهەمەکانت، لە حەفتاکاندا بەپێی ئەوەی چاپخانە وەکو ئێستا پێشکەوتوو نەبووە، کاتێک

بەرهەمێکتان چاپ دەکرد ئەو ئاستەنگانە چی بوون دەهاتە رێتان؟

– لایەنی باش هەبوو، لایەنی خراپ هەبوو، لایەنی باش ئەوە بوو ئێمە زۆر بالادەستبووین هەڵەکانمان کۆنترۆڵ کردبوو، تۆ کتێبەکانی ئەو سالانە بخوێنەرەوە کە بە دەستچن و بەلاینۆ تایپ چاپ دەکرا، جاری وا هەیە لە کتێبێکدا هەڵەیە دووان هەیە، بەڵام ئێستا لە یەک شیعردا چەندان هەڵە هەیە، ئەوانەی کاری تایپ دەکەن، یان کەمتەرخەمی دەکەن، یان شارەزاییان نییە، لە هیچ سەردەمێکدا، وەکو سەردەمی کۆمپیوتەر هەڵەی چاپ زۆر نییە، هەندێ نووسین هەیە، بەربادە، تاقەتی خوێندنەوەیت نییە، ئەوندە هەڵەی کۆمپیوتەریی تێدایە، بەڵام لە سالانی حەفتادا، یان لە شەستەکاندا، یان پێشتر، برۆ کۆواری گەلاوێژ بخوێنەرەوە بەدەگمەن هەڵەیەکی تێدایە کە بە پیتی دەستچن چاپ کراوە، برۆ کتێبەکانی عەلادین سەجادی، کوێرەوەری ژانی گەلی چاپی یەکەمی برایم ئەحمەد بخوێنەرەوە، یان کتێبەکانی شاکر فەتاح بخوێنەرەوە، هەڵەی چاپیان زۆر کەمە، ئەو رۆژنامەیەی کە پیرەمێرد لە چاپخانەی ژین دەری دەکرد، هەڵەی چاپی زۆر کەمە، ئەوانەی ئیشی پیتچنیان کردووە زۆر بە دڵسۆزی کردوویانە، بەڵام ئێستا دڵسۆزی لە کاردا نەماوە، هەڵەی کۆمپیوتەری بووە بە نەخۆشیی کولێرا بە سەر نووسینی کوردییەوە.

* لەوانەیە ئەوسا کارەکان بەلەخۆبووردوویی و دڵسۆزی کرابێت وەکو خۆت باست کرد، بەڵام ئێستا شتەکان بووە بە پارە، کەسێک کە کتێبێک بۆ تۆ، یان هەر کەسێکی تر چاپ دەکات، زیاتر مەبەستی پارەکەیە و گوێ بە هەندێ لایەنی تر نادات؟

– من دڵنیام ئەوسا کە پیتچنێک دیوانە شیعرێکی دەچنی بۆ ئەوەی ئامادەی بکا بۆ چاپ، بەکارێکی کوردایەتیی دەژمارد و لە قەڵەم دەدا، بۆیە هەوڵی دەدا لە فاریزەیەکیشدا هەڵە نەکات، بەڵام ئێستا بەپەلەپرووزێ دەکرێ و جاری وا هەبووە شیعرم بلاو بووەتەوە بە زاتی خوا، تاقەتم نەبووە بیخوێنمەوە، ئەوەندە

هەڵەی چاپی تێدا بووە، ئەمە دیاردەیەکی زۆر نالەبارە بە چاپەمەنیی کوردستانەوە دیارە، خانەی چاپە گەورەکان، ئاراس، بنکەی گەلاوێژ، چاپ و بڵاوکردنەوە، سەردەم خانەی وەرگێڕان و حەمدی، هەموو ئەمانە لە هەڵەی زۆر بەدەرنین، تەنانەت ئەو چاپەمەنییانەی لە بەغدا چاپ دەکرێ (وا بزانم لەوێش خانەیەکی چاپ و بڵاوکردنەوەی لێیە) ئەویش بەدەر نییە لەو هەڵانە، من جارێکیان لە نووسینێکمدا باسی ئەوەم کرد بوو پێویستە کۆنفراسێک ساز بکرێ بۆ مەسەلەی بنەبڕکردنی هەڵەی چاپەمەنی لە چاپخانەکاندا، بەداخەوە کەس بیری لەو کۆنفرانسە نەکردەوە.

* لەچاپدان لە ئێستادا بە بەراورد لەگەڵ شەستەکان و حەفتاکان چۆن دەبینی؟

– ئێستا چاپەمەنی زۆرە، چاپی باڵا و قەشەنگ و جوان، لە رواڵەتدا زۆر جوانە، بەڵام هەندێ جار هەڵەی چاپ وا دەکات کە کتێبەکە ناشرین بکا، ئێستا تازەترین ئامێری چاپەمەنی و شێوازی چاپکردن لە هەرێمی کوردستاندا هەیە، دەخوازم هەڵەبڕی چارەسەر بکرێت، وا نەبێت کتێبەکە ناشرین بکا و خوێنەر تاقەتی نەبێت بیخوێنێتەوە.

* بۆچوونت چییە لەبارەی ئەوەی ئێستا ئەو هەموو وشە ناکوردییانە لە کۆوار و رۆژنامەکاندا بڵاو دەکرێتەوە، ئاخۆ ئەمە لاوازیی زمانی کوردی دەگەیەنێ کە ناتوانێت گوزارشت لەو وشانە بکا؟ یان هەندێ کەس بۆ خۆ دەرخستن بە کاری دێنن؟

– هیچ وشەیەکی عەرەبی و فارسی نییە، لە کوردیدا بەرامبەرەکەی نەبێت، ئێستا هەندێ کەس فێربوون وشەی قەدەر و یەئس و حوزن و دەیجوور و شەففاف و راقی و... هتد، گەلێ لەم وشانە بەکار دێنن، بە راستی بە بۆچوونی من ئەمە تاوانێکە بەرامبەر بە زمانی کوردی دەکرێ، هەر لە زەمانی شێخ مەحموودەوە، هەر لە سەردەمی دامەزراندنی حکوومەتی عێراقییەوە کە بڕیار

درا پرۆگـرامی خـوێندن بە کـوردی هـەبێت، لە قـوتابخـانەکـاندا، هـەر لەو ڕۆژانەوە ڕۆشنبیرانی کورد هەوڵیان دا زمانی کوردی پاراو بکەنەوە و بنەبڕی بکەن لە وشەی بێگانە، ئیتر، بۆچی ئەمانە دەیانەوێ بیشێوێنن.

* کۆواری (الادیب) کە وەکو ڕۆڤاری سەردەم، هەر جارەی تایبەتە بە نووسەرێک، یان شاعیرێک، چەند جارێک داوایان لێ کردوویت چەند شـتێکی خـۆتیـان بدەیتێ و ژمـارەیەکی تایبـەت لەسـەر تۆ دەربکەن ڕازی نەبوویت، بۆ؟

- مەسـەلە ناڕازیبوون نییە، مەسـەلە کەمتـەرخـەمییە، کاک عـەبدولا تاهیر بەرزنجی و کـاک ئاوات حـەسـەن ئەمین، پێیـان ڕاگـەیاندم کـە عـەباس عـەبد جاسم، سەرنووسەری کۆواری (الادیب)، پێی وتوون دەمانەوێ لەسەر لەتیف هەڵمـەت ژمـارەیەکی تایبـەتی دەربکەین، جـا بۆیە پێی بڵێن هەرچی لەسـەری نووسـراوە کـۆی بکاتەوە، ئێـمـەش خـۆمـان بە چەند کـەسانێک دەڵێـین لەسـەر بابەت و دەقـەکـانی بنووسن و ژمـارەیەک ئامـادە دەکـەین، من هـەر پشـتگوێم خست. پێرار، نیوەڕوانێک خەریکی ئاوگرتن بووم تەلەفونێکم بۆ هات بەعەربی وتی، عـەباس عـەبد جـاسـم، سـەرنووسـەری کـۆواری (الادیب)ی بەغـدادی، بەفـلان و فـلاندا جـوابم بۆ ناردوویت کە کـارێکی وا دەکـەین، ئەوە خـۆشم پێت دەڵێم، خـۆت ئامـادە بکەی، وتـی بەلام وەلاهـی خـەڵکی تر پارەیان داوە ئینجـا بۆمـان کردوون، ئێمـە خـۆمـان بەبێ هیـچیش بۆت دەکـەین، بۆ کـەمتـەرخـەمی دەکـەیت، بەڕاسـتی بەڵێنم پێ دان کـە خـۆمـی بۆ ئامـادە بکەم، هـەروەهـا لە ڤـیـسـتـیـڤـاڵی گـەلاوێژی ٢٠٠٨ دا سـەرنووسـەر و هـەندێ لە دەسـتـەی نووسەرانیان هاتبوون، لەم کافتریای ئوتێل ئاشتییە کە ئێستا من و تۆ تیای دانیشتووین قسەمان زۆر کرد و دیدارێکیشی لەگەڵدا ساز کردم دوو دەقیشی لێ وەرگرتم، بەلام ئیتر نەمتوانی شتی بۆ بنێرم سەرقاڵ بووم بـەنووسینی تر و بابەتی ترەوە لـەوانە: کتێبی سۆفی و سۆفیگەرێتیی یەکەم، کە کاتی زۆر بردم و نەمتوانی بەدەنگ ئەوانەوە بچم، بەلام دەقێکی شیعریمی بلاو کردەوە،

زۆرم پێ خۆش بوو، ئێستاش نەچووە و بچێ رەنگە بکەومە، خۆم و خۆمی بۆ ئامادە بکەم.

## خوێندنەوەی شیعر

* شێوازی خوێندنەوەی شیعر چ کاریگەرییەکی لەسەر بیسەر و بینەر دەبێت؟

- لە یۆنان و ئەسینای کۆندا بە شانۆنووسیشیان هەر وتووە شاعیر، بێگومان زۆربەی شیعری ئەو دەمەی یۆنان و رۆمان شیعری شانۆیین، کەواتە شاعیر بیەوێت و نەیەوێت تا لە ژیاندا بێت خۆی، یان هەر کەسێکی تر شیعرەکانی خوێندەوە، دەبێ جۆرێ لە جۆرەکانی شێوازی شانۆی تێدا بەکار بێنێ، چ لە شێوەی دەنگدا، چ لە شێوەی جموجۆڵی دەست و چاو و دەم و هەندێ ئەندامی جەستەدا بە بۆچوونی من کاتێ شاعیر شیعر دەخوێنێتەوە، تەنیا شیعر ناخوێنێتەوە دیمەنێکی شانۆییش دەخاتە روو، لەبەرئەوە من خۆم بە بەختەوەر دەزانم کە لە خوێندنەوەی شیعردا سەرکەوتووم ناو ناڵێم، بەڵام جارێکیان لە کەرکووک فیستیڤاڵێکی شیعری کرا، برادەرێک وتی "ئەگەر لە دوای لەتیف هەڵمەتەوە بۆ خوێندنەوە دانرابم، من شیعر ناخوێنمەوە، وتیان بۆ؟ وتی ئەو ئیلقای شیعری زۆر بەهێزە، کاتێ شیعر دەخوێنێتەوە، سەرنجی خەڵک بۆ لای خۆی رادەکێشێ".

* بۆچی تۆ زۆرجار ناچیتە ئەو فیستیڤاڵە ئەدەبییانەی کە لە دەرەوەی عێراقن، بەتایبەتی ئەو فیستیڤاڵەی لە تورکیا ساز دەکرێ جەنابت بڕیارت دابوو نەچی؟

- من حەز دەکەم لە هەموو فیستیڤاڵ و کۆڕێکی ئەدەبیدا بەشداری بکەم، بەڵام هەندێک جار هەلومەرجی بەشداربوونم بۆ نارەخسێ، بۆ نموونە بۆ فیستیڤاڵی شیعری نێودەوڵەتیی ئەمساڵ لە تورکیا ئاگەدار کرامەوە، سەرەتا

برادەرێک تەلەفۆنی بۆ کردم لە تورکیاوە وتی منیش وەکو تۆ ناوم لەتیفە تۆ دەعوەتی بۆ فیستیڤاڵی نێودەوڵەتیی شیعر لە تورکیا و ژمارەی مۆبایلەکەتم لە کاک محەمەد حەمۆ وەرگرتووە، کاک محەمەد حەمۆ، کوردێکی کوردستانی رۆژئاوایە و لە سلێمانی دەژی، واش بوو دوایی خۆی پێی وتم، وتی من ژمارەکەتم داوە بە فلان کەس و پاسپۆرت و پێویستیی خۆت حازر بکە، ئەو کاتە دوو تەگەرە هەبوو، یەکێکیان ئەو کاتە پاسپۆرتم نەبوو، دووەم لە سواریی فڕۆکە دەترسم، ئەو رێگرانەم هەبوو کە نەمتوانی بچم بۆ ئەو فیستیڤاڵە.

* ئەی با بە ئۆتۆمۆبێل بچوویتایە.

– رەنگە من نەمتوانیایە لەو برادەرانە جیا ببمەوە کە خۆیان لەوێوە بانگهێشتیان کردوون، هەر دەبووایە بە فڕۆکە بچم، هەندێک جاریش حەزیشم کردووە بچم، دوایی شتەکە پشتگوێ خراوە، هەر بۆ نموونە دەیڵێم من دوو جار لە وەزارەتی رۆشنبیرییەوە، کاتی خۆی ئاگەدار کرامەوە ساڵی ٢٠٠٥ و ٢٠٠٦، جارێکیان برای بەڕیز و خۆشەویستم، کاک هەڵگورد عەبدولوەهاب، ئاگەداری کردمەوە، جارێکیشیان برای بەڕێز و خۆشەویستم کاک عەلی مەندەلاوی کە ئەو دوو ساڵە هەردووکیان بەڕێوەبەری گشتی بوون لە دیوانی وەزارەت، یان راوێژکاربوون نازانم، تەلەفۆنیان بۆ کردم وتیان تۆ بەشداری لە پێشانگەی فرانکفۆرت لە ئەڵمانیا، خۆتی بۆ ئامادە بکە، بەڕاستی من زۆرم هەوڵ دا خۆمی بۆ ئامادە بکەم، بەڵام ئیتر ئەوان بێدەنگ بوون، بێگومان پێشانگەی فرانکفۆرت کۆڕی شیعریشی تێدایە، من دڵنیام شاعیرێکی کورد بچێ بۆ ئەوێ، کۆڕێکی شیعریش هەر ساز دەکرێ، حەزم دەکرد بچم، بەڵام ئەو بانگهێشتە لەسەری نەڕۆشتن و دووبارەیان نەکردەوە، هەندێ جار تەگەرەی واشی تێ دەکەوێ، جارێکیش لە دەرەوە بەشداریی کۆڕی شیعریم کردووە، لە یادی سەید تاهیری هاشمیدا لە کرماشان و لە سنەش بەشداریی کۆڕ و ڤیستیڤاڵی شیعریم کردووە، ئەگەر هەلومەرج بڕەخسێ، حەز دەکەم، ئەگەر هەلومەرجیش نەڕەخسا، بەدەست خۆم نییە.

* پرسیارێکت لێ دەکەم لەسەر قسەیەکی خۆت، لە نووسینێکتدا دەڵێی: زۆربەی ئەو چیرۆک و رۆمانە ئەوروپییانەی کە پڕوپاگەندەیان بۆ دەکرێت و گوایە شاکارن زۆربەیان بێ بایەخن و ئەگەر بە کوردی بنووسرانایە، خەڵک گاڵتەی پێ دەکردن، دەتوانی نموونەمان بدەیتێ؟

- زۆر بەدڵنیاییەوە دەیڵێم، ئێستاش دووبارەی دەکەمەوە، زۆربەی ئەو دیوان و رۆمانانەی کە بە شاکار ناوبراون نە رۆمانن نە شیعرن، ئەگەر کوردێک بینووسیایە، بەڕاستی کەس نەیدەخوێندەوە، ئەوان کولتووری خۆیان هەیە و سنووری خۆیان هەیە، سنوور و کولتوور زۆر گرینگە، هەموو وڵاتێکیش سنوور و کولتووری جیاوازی خۆی هەیە، کاتێک بەرهەمی خۆی هەناردە دەکات. چۆن پڕوپاگەندەی خراپترین کەرەستەی رۆژانەی خۆی بە باشترین کەرەستە دەکات، کاتێک شقارتە، یان شەکری ئێکسپایەرمان بۆ دەنێرێت بە نرخی ئەسڵی و دەرەجەی یەک، بەو شێوەیەش کاتێک ئەدەبەکەشی وەردەگێڕێت بۆ زمانێکی تر چ رۆمان بێت، چ شیعر بێت، یان هەر دەقێکی تر بە باشترین دەق لە قەڵەمی دەدا، بەلاشییەوە گرینگ نییە پارەیەکی زۆری لەپێناودا خەرج بکا بۆ ئەوەی بڵێ من شاعیرێک، یان رۆشنبیرێک، یان رۆماننووسێکی گەورەم هەیە، من بەدەیان رۆمانی ئەوروپیم خوێندووەتەوە، هیچی لا جێ نەهێشتووم، بەدەیان دیوانە شیعریشم خوێندووەتەوە، ئەویش هیچی لەلا جێ نەهێشتووم، بەڵام من ناتوانم بڵێم شاعیر گەلێکی وەکو عەزرا پاوەند وەکو لۆرکا و مایکۆفسکی و پۆشکین و ت.س.ئیلیۆتی ئینگلیزی و واڵت ویتمان، شاعیرگەلێکی گەورە نین، باسی عەرەبەکان ناکەم، چونکە بۆچوونی خۆم هەیە و بەبۆچوونی من شیعری عەرەبی لە شیعری ئەوروپی زۆر زۆر بەهێزترە، بەڵام عەرەب زمانی ریکلامی نییە، شیعری کۆنی فارسییش لە شیعری زۆربەی وڵاتانی دنیا بەهێزترە، ئەگەر فارس زمانی رێکلامیشی نەبێ سەعدی و حافیزی شیرازی خۆیان زمانی رێکلامیان هەیە و خۆیان بە هەموو

جیهان ناساندووە، لێرەدا، مەبەستمان ئەوەیە زۆربەی شیعر و ڕۆمانی ئەوروپایی لەو ئاستەدا نین، من لە دوا پێشانگەی کتێبی مەدادا، سەیر دەکەم بە دەیان ڕۆمانی غارسیا مارکیز لەوێیە دەیان ڕۆمانی فلان و فلان، بەڕاستی سەرم سوڕ ما، بە بۆچوونی من ڕەنگە مارکیز دوو سێ ڕۆمانی باشی هەبێت، وەکو سەد ساڵ تەنیایی و پایزی بەتریریک و... هتد. بەڵام بەو شێوەیە بیست سی ڕۆمان بخەیتە بازاڕەوە و ڕۆماننووسین، ببێت بە پیشەیەک وەکو دارتاشی و ئاسنگەری پەسەند نییە، چۆن ئەوان ڕۆژانە کۆمەڵێ پەنجەرە و دەرگە دەخەنە بازاڕەوە، تۆش ئاوا بتەوێ هەموو ساڵێ ڕۆمانێ بخەیتە بازاڕەوە، ئەمە دەبێ بە شتێکی بازرگانی، وەلایی پڕ بەدڵ دەیڵێم ئێستا وام لێ هاتووە ڕۆمانی مارکیزیشم بەدڵ نییە، چونکە بووە بە شتێکی بازرگانی، بەڵام پۆشکین و لۆرکا و واڵت ویتمان و رامبۆ و بۆدلێر... هتد، نرخی شیعریان زانیوە، ئەمانە نەهاتوون ساڵانە و ڕۆژانە، بەرهەم بخەنە بازاڕەوە، ڕۆمانی سەعات بیست و پێنج، یان تاوان و سزا، یان هەندێ ڕۆمانی جەنگیز ئەیتەماتۆف، یان تاعوونی کامۆ....... من باسی ئەمانە ناکەم، ئەمانە شاکارن.

زۆربەی شیعری ئەوروپایی کە ئێستا پێشانگەیەکی کتێب دەکرێتەوە، هەر شاعیرێکی ئەوروپایی دەبینی بەرهەمەکانی وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی و دەڵێ، ئەمە شاعیرێکی وا و وایە و کۆمەڵێ ناوونیشانی گەورە دەدەنە پاڵی، بەڵام هیچی تا ئێستا لە ئاستی گۆتەدا نییە، لە ئاستی لامارتین و دیمۆسێیدا نییە، یان لە ئاستی ڕامبۆ و هۆگۆ و بۆدلێردا نییە، کۆمەڵێ دیوانە شیعری تورکیشم خوێندووەتەوە، هەر لەو ئاستەدا نین، دەمەوێ بە کورتی بڵێم بە بۆچوونی من شیعری شاعیرە باشەکانی ئێستای کورد، باڵابەرزترین شیعرە لە جوگرافیای شیعری جیهاندا، بەڵام بەداخەوە، وەکو دەنگی میللەتی کورد کە چل ملیۆن زیاترە و ناگاتە کەس و تا ئێستا ئالایەکی لەسەر بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان نییە، ئاوا بوار نادەن شیعرەکەشی ئالای هەبێ و دەنگی هەبێ.

* له نووسینێکتدا (گفتوگۆیەکی ڕۆژنامەنووسی لەگەڵ خۆم) دەتەوێ چی بڵێیت؟ وەکو شتێکی نوێ خۆت پرسیارت کردووە و خۆشت وەڵام دەدەیتەوە.

- هیچ کەسێک تەنیا خۆی نییە، زۆرجار ئێمە دوو کەسین، کەسێکی زۆر دڵپاک و کەسێکی دڕندە و فێڵباز، دەمانەوێ لەگەڵ هەموو کەسێک پردی خۆشەویستی و ئاشتی دروست بکەین، لە هەمان کاتدا کەسی بەرامبەرمان کە هەر خۆمانین دڕەندەترین کەسە، دەیەوێ هەموو شتێک بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و هەموو شتە جوانەکانی دنیا بۆ خۆی بێت، من وەکو شاعیرێک دەمەوێ هەموو شیعرە جوانەکانی دنیا هی من بن، ئەمە خودە دڵپاک و چاکەکەم نییە، چونکە خۆپەرستییەکم تێدایە کە دەمەوێ هەموو شیعرە جوانەکانی دنیا هی من بن، لەبەرئەوە من کە پەیڤین لەگەڵ خۆمدا دەکەم، لەگەڵ خودەکانی خۆمدا دەکەم، دەمەوێ لە ناخی خۆمەوە ناخی هەموو مرۆڤایەتی بخەمە ڕوو پێیان بڵێم، کەس یەک خودی نییە، هەموومان چەندان خودمان هەیە بەپێی پێویست و کات و هەلومەرج و بەپێی بەرژەوەندی و ئایدیا و بیرکردنەوەی خۆمان ئەو خودانەمان، وەکو ئەکتەر بەکار دێنین، هەموو مرۆڤێک ئەکتەرە، دەبینین ئەکتەرێک لە دەیان شانۆدا دەوری چاک و خراپ دەبینێت، هەموو کەسێکیش لە ژیانی ئاساییدا ڕۆڵی چاک و خراپ دەبینێت، من دەمەوێت لە ڕێگەی خودەکانی خۆمەوە بە خەڵکی تر بڵێم، ئێوە یەک خود نین، سەرکردەیەک کە قسە و بەڵێن و گفتی جۆراوجۆر و بریقوباق بە هاونیشتمانانی خۆی دەدات، لە هەمان کاتدا سەرکردەیەکە جێگە بۆ خۆی خۆش دەکات، ئەوە بوو بە دوو خود، ئەگەر پێویست بکا، دەبێ بەسێ خود، شاعیرێکیش کاتێک کە شیعرێک دەخوێنێتەوە لە فیستیڤاڵێکدا باسی مرۆڤایەتی دەکات، بەڵام لە ڕێگەی ئەو شیعرەوە دەیەوێت، ئیش بۆ خودی خۆی بکا و خۆی بەخەڵک بناسێنێ، مەبەستم ئەوەیە مرۆڤ یەک خودی نییە، بگرە دەیان خودی هەیە.

# ژنه شاعیرەکانی کورد

* سەبارەت بە ئافرەتە شاعیرەکانی کورد، ئاخۆ تا چەند توانیویانە بگەنە ئاستێکی شاعیرێتیی بەرز؟

– ئەمە دەبێ لە دەرەوەی ئافرەتی کوردەوە دەست پێ بکەم، زۆربەی بەرهەم و شیعری ئافرەتانی غەیرە کورد، دەخوێنمەوە ناڵێم لە ئاستی ئافرەتە شاعیرەکانی کورددان، بەڵام ئەو شاعیرە گەورەیە نین کە زۆرجار پروپاگەندەیان بۆ دەکرێ، بەڵام تیاشیاندا هەیە شاعیری زۆر باشن، وەکو غادە سەمان، ئەحلام مستەغانمی کە شاعیر و رۆماننووسن، هەروەها ئەمەل جبووری و (فدوی تۆقان) و (نازک ملائکە)، هەندێکی تریش کە رۆڵیان هەبووە لە شیعر و رۆشنبیریدا، ئافرەتە شاعیرەکانی کوردیش یەکجار وا دەسەپاچە نین، لە دیوانەکەی ئەسیریدا قەسیدەیەک هەیە زۆرجار دەیخوێنمەوە، تەنانەت دەمەوێ وتارێک لەو بارەیەوە بنووسم.

ئەسیری لەو قەسیدەیەدا باس لەوە دەکات، سەفەرێکی کردووە بۆ ناو عێڵەکانی جاف، دەڵێ ژنی وام دەبینی، شەڕە شیعری دەکرد و شیعرەکانی شێخ رەزای هەموو لەبەر بوو، ئێستا ئێمە لێرەین ئەگەر پیاوێک ئەو شیعرانەی شێخ رەزا بخوێنێتەوە لەناو پیاوانیشدا رەنگە لەلای هەندێ کەس شوورەیی و نەنگی بێت، بەڵام ئەسیری دەڵێ چەندان ژنم بینیوە لەناو خێڵەکانی جافدا کە هەموو شیعرەکانی شێخ رەزایان لەبەر بووە و لەگەڵ پیاودا شەڕە شیعریان پێ کردووە و دەشڵێ ئەو ژنانە خۆشیان شاعیری پلە یەک بوون و ئافرەتان مۆری تایبەتیی خۆیان هەبووە و زۆربەیان خوێنەوار بوون، ئەمە شانازییە شاعیری کورد وەک ئەسیری، لە گەشتێکیدا تۆماری کردووە کە چووە بۆ کوردستانی رۆهەلات.

تا ئێستا کەس لەم شیعرەی نەکۆڵیوەتەوە، من بەتەمام لێکۆڵینەوەیەک بکەم و لەسەر ئەوە بنووسم و بە مێژوونووسان بڵێم، بگەڕێنەوە بۆ ئەو سەردەمە بزانن، ئەو ئافرەتانە کێ بوون، بزانم دەتوانین بە کنە و پشکنینێک ناوی ئەو

ئافرەتانە ساغ بکەینەوە کە ئەسیری باسیان دەکات. ئەگەر ئێمە ئەمەمان کرد شتێکی گەورەمان کردووە و ئەوسا دەیان مەستوورەی کوردستانی دەدۆزینەوە کە ئێستا لێمان ون بوون.

بێینە سەر ئێستاش، ئافرەتی کورد، بەگوێرەی ئەو سنوورەی لە سەربەستیدا هەیەتی توانیویەتی دەقی جوانی هەبێ و چەندان ناوی باش و کارامە هەن لە جوگرافیای رۆشنبیریی کوردیدا و ئێستا دەوری بالآیان هەیە لە پەرەپێدانی رۆشنبیریی کوردیدا، ناو نالێم، چونکە دەترسم ناوێکم بیر بچێ، یان ناو بلێم و ناوێکی تر هەبێ لەلای خەڵک زۆر لەو باشتر بێت، بەلام لای من وا نەبێت و پڕوپاگەندەیەکی حزبی یان هۆکارێکی تر لە پشتییەوە بێت، بەلام دەڵێم، جوانیی جێ دەستی ئافرەتی کورد لە نووسیندا دیارە و خالی نییە و پڕە لە یاقوت و مرواری لەو سنوورەدا کە سەربەستیی پێ دراوە.

## هاوکاریکردنی گەنجان

* زۆرجار دەوترێ تۆ هەموو کەسێک رەفز دەکەی و تەنیا خۆت بە داهێنەر و شاعیر دەزانی، لە زۆربەی بوارەکاندا، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی زۆر کەس لە خۆت برەنجێنی، لە سەر ئەو قسەیە، چیت هەیە بیلێی؟

– من لە سالی حەفتاوە تا ئێستا رەنگە نێزیکەی حەفتا، هەشتا پێشەکیم نووسیبێت بۆ شاعیرانی لاو و دیوانەکانیان، یان بەرهەمەکانیانم هەڵسەنگاندبێت، دەتوانم بلێم پەنجا تا سەد شاعیری کوردم بە عەرەب ناساندووە، شیعرەکانیانم وەرگێڕاوە و کردوومە بە عەرەبی و وتوویشمە ئەمانە لە شاعیرە باشەکانی کوردن، هەموو ئەو دیوانانەش کە پێشەکیم بۆ نووسیون، هەموویانم هان داوە و تەنانەت جارێکیان پێشەکیم بۆ برادەرێک نووسیبوو برادەرانی خۆشەویستی خۆی هەندێکیان گلەییان لێ کردم، وتیان کەی ئەو شاعیرە لەو ئاستەدایە کە تۆ ئەو پێشەکییە جوانەت بۆ نووسیوە؟

ئایا ئەگەر کەسێک ئەم هەموو پێشەکییەی نووسیبێت و دەستی لاوانی گرتبێت و هانی دابێتن و نێزیکەی پەنجا شاعیری لاوی بە عەرەب ناساندبێت؟ ئەمە خۆپەرستییە؟ یان قوربانیدانە؟

من دەمتوانی ئەو کاتەی بۆ ئەوانم تەرخان کردووە بۆ بەرهەمەکانی خۆمی تەرخان بکەم، من چی بکەم؟ بەڕاستی دەیڵێم ناکرێ میللەتێک هەمووی داهێنەر و شاعیر بێت، بەڵام دەکرێ بە فلان بڵێین باشە، بە فلان بڵێین، هێشتا ماویەتی، لە بواری نووسیندا نووسینی باش هەیە و نووسینی شاکار هەیە، ئێمە نووسینی باشمان زۆرە، شاعیر و رۆماننووس و چیرۆکنووس و رەخنەگری باشیشمان زۆرە، بەڵام داهێنەر و شاکارمان کەمە، لە هەموو دنیاشدا وایە.

لە ئەدەبی تورکیدا خۆ هەموو رۆماننووسەکان وەکو یەشار کەمال نین و شاعیرەکانیش وەکو نازم حیکمەت نین، لە پاڵ ئەو کوردانەی کە هەر رۆمان دەنووسن محەمەد ئوزون هەیە، من ناتوانم بیخەمە ئاستی یەشار کەماڵەوە رەنگە بەچیرۆکنووسێکی سەردەمی دەرەبەگایەتیی لە قەڵەم بدەم، بەڵام یەشار کەمال داهێنەرە. هەروەها شاعیرەکانی فارسیش هەمووی ئەحمەدی شاملو و سوهراب و فروغ نین، ئیتر لە پاڵ ئەوانەدا کۆمەڵێ شاعیری تریش هەن، برادەرێک تەلەفۆنی بۆ کردم وتی خەڵکی رۆژهەڵاتی کوردستانم و دوو دیوانی شاعیرێکی هاوچەرخی فارسیم وەرگێڕاوە (شاعیرەکە ناوداریشە و لە دوا فیستیڤاڵی گەلاوێژیشدا بەشدار بوو) داوای لێ کردم پێداچوونەوە بەکوردییەکەیدا بکەم، من خۆشحاڵ بووم ئەم کارانەش دەکەم کە دوورە لە خۆپەرستییەوە و هاندانی لاوانە بۆ ئەوەی کە کاری جوان بکەن، بەڵام زۆر لام سەیر بوو وتیشی شاعیرێکی ناودارە، دەی بەخوا لەلاپەڕەی رۆژنامەکانی خۆماندا دەیان شیعر هەن لە شیعرەکانی ئەو شاعیرە فارسە زۆر جوانترن و لە ناوەڕۆک و شێوەشدا زۆر لەو باشترن کە رەنگە کەس نەیانناسێت، بەڵام بەداخەوە، ئێمە دەچین هی ئەو دەکەین بە کوردی و ئەوانەی خۆشمان ناخوێنینەوە.

من بۆچی خۆپەرستم و کەسم بەدڵ نییە، لە زۆر دیدەنی و چاوپێکەوتندا وتوومە، دەتوانم بیست شاعیری کورد بەس لە چایخانەی مەچکۆ و شەعبدا دەستنیشان بکەم، کە شایانی خەڵاتی نۆبڵن و گەلێ لەوانەی کە نۆبڵیان وەرگرتووە لە شیعردا زۆر لە خوار ئاستی ئەو برادەرە شاعیرانەن کە لە چایخانەی شەعب و مەچکۆ دادەنیشن، بەڵام بەداخەوە رەنگە ئەمان هەندێکیان بەقەرز چایەک بخۆنەوە و لە وڵاتانی ئەوروپاش خەڵاتی نۆبڵ دەدرێ بە ژنە شاعیرێکی وەکو شیمبۆ ریسکا، بە خوا من ناتوانم هیچ شیعرێکی لە سەرەوە تاخوارەوە بخوێنمەوە، چونکە لەو ئاستەدا نییە نۆبڵ وەربگرێ.

## کتێبخانەی شاخ

* با لەسەر سەردەمی شاخ پرسیارێکت لێ بکەم، ئەو کاتانەی لە شاخ بوویت لەگەڵ کتێب خوێندنەوەدا چۆن بوویت؟ کتێبتان چۆن دەست دەکەت؟

– سالانی حەفتا و چوار و حەفتا و پێنج کتێبخانەیەکی گەورە هەبوو لە چۆمان، شاعیری خوالێخۆشبوو عەبدولخالق سەرسام لەوێ بوو، من زۆرجار دەچووم لەوێ کتێبم، دەهێنا، جارێکیان یەک دوو کتێبم دەویست، نەیهێشت بیبەم، خەریک بوو بەشەڕە تفەنگ کتێبەکانی لێ بەنم و بیبەم، بەهەرحاڵ ئەو ساڵە کاک فەرهاد شاکەلی و کاک محەمەد موکری و کاک سەلام مەنمی و فوئاد حەمەخورشید و کەمال میراودەلی و کاک ئەنوەر قادر جاف و عەبدولڕەحمان مزووری و کۆمەڵێ برادەر خۆیان کتێبی تایبەتییان بۆ دەهات، ئیتر کتێبەکانمان دابەش دەکرد بۆ ئەوەی هەموومان بیخوێنینەوە، هەر کەس کتێبێکی بۆ بهاتایە، هەموومان دەمانخوێندەوە، زۆربەشیان کە دەچوون بۆ ئێران بۆ سەفەر کتێبی فارسییان دەهێنا، من ئەوسا هیچ شتێکم لە فارسی نەدەزانی، بەڵام، ئێستا شتێکی لێ دەزانم.

* باسی نێوانی خۆت و کاک عەبدولا بەرزنجیم، بۆ بکە، کڕین و فرۆشتنەکانتان لە بواری کتێبدا.

- کاک عەبدولا تاهیر بەرزنجی کاتێک کە پارەی پێ بێت دەچێ لە پێشانگەیەکدا بایی پێنج شەش گەلا کتێب دەکڕێ، هەندێ لەو کتێبانە ناخوێنێتەوە، هەر چاوێکیان پێدا دەخشێنێ و تەواو رەنگە زۆر نەچن بەدڵیا، ئەو زۆر بەسەرگەرمییەوە کتێب دەکڕێ و دوایش سەیری کرد زۆر بەدڵی نییە، دەیەوێ بیفرۆشێتەوە بەلاشییەوە، گرینگ نییە ئەگەر بە سەد دۆلاری کڕیبێت، بیدات بە بیست دۆلار، یان جاری وا هەیە پێشانگەیەک دەکرێتەوە، دەچێ کۆمەڵێ کتێبی لێ دەکڕێ، دوا بەدوای ئەوە پێشانگەیەکی تر دەکرێتەوە کتێبی باشتری تێدایە پارەی نییە، دێت ئەو کتێبانەی تر هەڕاج دەکات، جاری واهەیە تەلەفۆنم بۆ دەکات دەڵێ کتێبم هەیە، نایکڕیت؟ بە هەرزان دەتدەمێ زۆرجار کتێبم بە هەرزان لێ کڕیوەتەوە، کتێبی زۆر باشیش، خۆش ئەوەیە دوای ئەوەی کە کتێبەکانی پێ فرۆشتووم تەلەفۆنی بۆ کردوومەتەوە پاش شەش حەوت مانگ، یان ساڵێ دەڵێ، من فلان کتێب و فلان کتێبم پێ فرۆشتی، ماوتە، دەڵێم، بەڵێ ماومە، دەڵێ، پارەی زیاترت دەدەمێ ئەگەر پێم بفرۆشیتەوە، منیش پێی دەڵێم بەو خوایە ئەگەر بەدە هەزار لێم کڕیبێتی، سەد هەزارم بەیتێ هەر ناهێڵم بشیبینی، جاری وا هەیە دەڵێ وەکو سەرچاوەیەک بەکاری دێنم، دەڵێم من لەو کەسانە نیم سەرچاوە بۆ کەسی تر دابین بکەم، من لەوەدا زۆر رژدم و بابڵێین دەستنووقاوم سەرچاوە ناخەمە بەردەست نووسەرانی تر.

من پێم وایە ئەگەر نووسەر پێویستی بە سەرچاوە هەبوو لە تورکیا بوو لە دیمەشق بوو، یان لە ئێران بوو، چۆن پارە دەدا سەلاجە دەکڕێ و جوانترین فەرش و جوانترین مۆدێلی ئۆتۆمۆبێل دەکڕێ، ئاواش پارە بۆ کتێبێک خەرج بکا، کتێب وەکو ئاو و نان زەرورییە، من ئامادە نیم سەرچاوەیەک کە بەهەزار ماندووبوون و ئارەقڕشتن و زەحمەت دەستم کەوتووە، بەئاسانی

بیدەم بە یەکێک و دوایی وتارێک بنووسێت و خۆی پێ هەڵکێشێت.

* بۆچی لەوانەیە ئەو کەسە لەو کاتەدا ئەو کتێبەی دەست نەکەوێ، ناکرێ، هاوکاریی بکەیت؟

– ئەو کتێبە ئەگەر عەرەبی بێت لێرەش دەست نەکەوێ، لە بەغدا و دیمەشق و قاهیرە هەیە، لە لبنان هەیە، با فێر بن، وەکو چۆن لێرەوە دەچن بۆ ئەورووپا و وڵاتانی خەلیج و پارەیەکی زۆر خەرج دەکەن، با یەک دوو هەزار دۆلاریش بۆ دەستکەوتنی کتێبێک خەرج بکەن.

* با بێینەوە سەر شیعرەکانت، لە زۆر شیعرتدا، زۆر هەجووی پاشا دەکەی، جارێک دەڵێیت کورسی نازانێ کەری لەسەر دانیشتووە، جارێکیش دەڵێی، کوژرانی پاشا لە شەترەنجیشدا بێت هەر خۆشە، بۆچی ئەم هەموو رقەت لە پاشایە؟

– من حاڵەتێکی سۆفییانەم هەیە، سۆفی باوەڕی بە یەکەتیی دینەکان هەیە، بەلای سۆفییەوە، هەموو ئاینەکان پیرۆزن لە ئیسلامەوە تا بودی و بتپەرست، ئەمە لە زاراوەی سۆفیگەرێتیدا، یەکەتیی ئاینەکانی پێ دەڵێن ئاینەکان، یەک سەرچاوەیان هەیە، کورد دەڵێ، هەموو رێگەکان دەچنەوە بانە، عەرەب دەڵێ، هەموو رێگەکان دەتبەنەوە رۆما، سۆفییەکانیش دەڵێن هەموو رێگەکان بەرەو لای خوا دەڕۆن، بە بۆچوونی من سۆفیگەرێتی کە خۆم باوەڕم پێیەتی، باوەڕی بە ئازادی هەیە، باوەڕیشی بەیەکەتیی ئاینەکان هەیە، مانای وایە ئازادیی بیروڕا و ئاین بڵاو دەکاتەوە، چی بەربەستە لە رێی بیروڕای ئازاد و ئاینی ئازاددا بێگومان پاشاکان، بیرم نەچێ نازانم تۆ سەرگوزەشتەی سوڵتان مەحموودی غەزنەویت خوێندووەتەوە یان نا، لەشکرێکی گەورە و گرانی کۆ کردووەتەوە، بەناوی ئیسلامەوە و هێرشی کردووەتە سەر هیندستان و سەر بوداپەرستەکانی هیندستان، هەرچی پەیکەری زێڕینی بودا هەیە شکاندوویەتی (من موسڵمانم کە ئەم قسانەش دەکەم، زۆریش پێوەستم بە

ئاینی ئیسلامەوە، بەلام پێشم ناخۆشە سوڵتان مەحموودی غەزنەوی وای کردووە)، ماوەتەوە سەر گەورەترین بتیان، بودییەکان وتوویانە ئەو بتە لە شاخێکی زۆر گەورە هەڵکۆڵراوە ئینجا گیراوەتە ئاڵتوون، پێیان وتووە بەسەنگاییی ئەو بتە ئاڵتوونت دەدەینێ، بەس مەیشکێنە، وتوویەتی، من دەمەوێ سوڵتان مەحموودی بتشکێن بم، نەک سوڵتان مەحمودی بتپارێز، سوڵتانەکان و پاشاکان ئەمە کاریانە، کاریان ئەوەیە، ویژدانی خەڵک ئازار بدەن و ئازاد لە خەڵک بسێننەوە، لەبەرئەوە منیش بە بچووکترین شێوە بمەوێ نارەزاییی خۆم دەربڕم بەرامبەریان بە وشەیە، من لە تۆ دەپرسم تو خوا ئاخۆ ئەوە بێ عەقڵی نییە سوڵتان مەحموودی غەزنەوی کردوویەتی، بەسەنگاییی ئەو بتە ئاڵتوونی بدەنێ دەیتوانی هەموو ولاتەکەی خۆی پێ ئاوەدان بکاتەوە، بەلام، ئەوەی نەویستووە و بتەکەی شکاندووە، ئەمە بێ عەقڵی نەبێ چییە؟

* خۆت چەند ساڵێک لەناو حزبدا پێشمەرگە بوویت، کەچی بە نەرێنی باس لە حزبایەتی دەکەیت، وا دەردەکەوێ، زۆر رقیشت لە سیاسەتە، چۆن توانیوتە ئەو کاتە لە شاخ هەڵکەیت؟

– شۆڕشگێریش هەر ئەوە نییە؛ پڕوپاگەندە بۆ شۆڕشێک بکەیت، مەحموود دەرویش لەناو فەڵەستیندا بوو، بەلام دیوانی (عاشق من فلسطین)ی نووسی، قەسیدەی (سأقاوم – بەرگری دەکەم)ی نووسی، هەروەها سەمیح قاسم تا ئێستاش لە ناوجەرگەی ئیسرائیلدا دەژی و زۆرجاریش پۆستی گەورە گەورە وەردەگرێ و شاعیرێکی بەرگریشە، واتە شیعرەکانیشی لە پێناوی کێشە و دۆزی فەڵەستینیدایە و دژی ئیسرائیلە.

یەکێک کە شۆڕشگێڕ بوو لە هەر ولاتێک، دەچینەوە سەر سۆڤیەت مایکۆفسکی ئەو هەموو شیعرە جوانەی بۆ ڕێژیمی سۆڤیەتی وتووە، بەلام رەخنەشی لێ گرتووە، شۆڕشگێڕیەتی، یان پێوەست بوون بە شۆڕشگێڕیەتییەوە، مانای ئەوە نییە ئیتر تۆ رەخنە لەو لایەنە نەگریت کە

پێوەی پێوەستی، شۆڕشگێڕ بە هەموو کارێکی جوان دەڵێ، جوان و بە کاری خراپیش دەڵێ خراپ، ئەگەر ئەو کارە شۆڕشگێڕێکیش کردبێتی، لە هەموو جیهاندا وایە. تۆ بڵێی مەحموود دەروێش و سەمیح قاسم و تۆفیق زیاد رەخنەیان نەبووبێت لە رەوتی شۆڕشی فەڵەستینی، بێگومان هەیانبووە.

من پێم وایە نابێت شاعیر لە هیچ لایەنێکدا بتوێتەوە، دەبێت شاعیر شاعیری ئازادی بێت، هەر شتێک بوو بە بەربەست لە رێگەی ئازادیدا، شاعیر دەبێ رەخنەی لێ بگرێ.

## مامۆستا هێمن

* کاتێک کە لە بەغدا بوون لەگەڵ شاعیری گەورە، مامۆستا هێمندا نێوانتان هەبووە، بەتایبەتی لە کۆڕ و سیمینارەکاندا چەندان جار پێکەوە بوون، دەکرێ باسێکی کەسایەتیی مامۆستا هێمن و پێوەندیی هەردووکتان بکەیت؟

– مامۆستا هێمن زۆرجار ئێواران لە کۆمەڵەی رووناکبیریی کورد لە بەغدا کە بەڕێزان د. مارف و د. عزەدینیشی لێ بوو، لەگەڵ کاک جەمال خەزنەدار، لە مانگێکدا شەش ئێوارە بۆ دە ئێوارە کۆڕ هەبوو، کۆڕی شیعر و چیرۆک خوێندنەوە و رەخنە، بەڵام سەیر ئەوە بوو لەو ساڵە رەش و کوشت و بڕینانەدا کە رێژیمی بەعس هەموو هێزێکی خۆی خستبووە کار بۆ دژایەتیکردنی کورد و نەتەوە و رۆشنبیریی کوردی و قوتابییان رۆشنبیران و خوێندکاران بەتایبەتی رۆڵی بالایان هەبوو، دەهاتن بۆ ئەو کۆڕ و فیستیڤاڵە رۆشنبیرییانە کە لە بەغدا دەکراو ، دەبوو بە چەپڵەڕێزان، جاری وا هەبوو دەبوو بە نیمچە خۆپێشاندانێک و ئەگەر زوو بڵاوەیان نەکردایە، رەنگە زیانیان پێ بگەیشتایە، لەو کۆڕانەدا زۆرجار مامۆستا هێمن ئامادە دەبوو و شیعری دەخوێندەوە، لاوان و خوێندکاران زۆریان خۆش دەویست، ئەگەر شیعریشی نەخوێندایەتەوە داوایان دەکرد مامۆستا هیمن هەستێت شیعر بخوێنێتەوە.

ماموستا هێمن فارسییەکی باشیشی دەزانی، زۆرجار پێم دەوت ماموستا حەز دەکەم تۆ شاکارە فارسییەکانمان پێ بناسێنی و شیعری فارسیمان بۆ تەرجوومە بکەی، ئەو ئەو کارەی هەر نەکرد و بۆی نەلوا شاکارەکانی فارسی چ شیعری نوێی فارسی و چ شیعری کۆنی فارسی بکا بە کوردی، زۆر بۆچوونیشی لەگەڵ شیعری نوێدا نەبوو، حەزی لە شیعری کێش و سەروادار بوو، تەنانەت دەیوت، ئەو شیعرەی کێش و سەروای نەبێ شیعر نییە، من جارێکیان پێم وت، ماموستا باران باری رستەیەکی شیعرییە، یان شیعری نییە؟ وتی شیعری نییە، وتم، منیش لەگەڵتام باران باری، رستەیەکی شیعری نییە کە باران باری، هەموومان دەڵێین باران باری، وتم، من ئێستا ئەم رستەیەت بۆ دەگۆڕم دەیکەم بەشتێکی تر، وتی، دەی، وتم، دەیکەم بە شیعر بەبێ کێش و سەرواش، وتم: لەناو پەڵە هەورەکانەوە/ هەزاران پەریی قژ سەوز و سپی/ هاتنە خوارەوە و دەستی یەکیان گرت و/ هاتنە سەر زەوی و لەژێر پێیاندا فەرشێکی سەوز چنرا/ وتم، ئەمە شیعرە، یان نا؟ وتی، شیعرە، ئێ، وتم، خۆ ئەمە باسی باران بارینە، یەعنی قەناعەتی کرد دیاربوو، بەهەڵە لە مەسەلەی شیعری نوێ و شیعری کۆن گەیشتبوو، ئێستاش زۆر کەس هەن لەو بارەیەوە بیر و بۆچوونی وایان هەیە دەبێ بابەتەکەیان زۆر بۆ روونتر بکرێتەوە بۆ ئەوەی بتوانن نهێنییەکانی شیعری نوێ وەربگرن.

شتێکی زۆر سەیر کە لە ماموستا هێمنم بینی، زۆر لە ئۆتۆموبێل دەترسا، شەقامەکانی بەغدا زۆر قەرەباڵغ بوون، زۆرجار بووە چەند کەسێک لە کۆمەڵەی رووناکبیری کوردییەوە بە راغیبەخاتوونی بەغدادا هاتوونەتە خوارەوە، هەتا سەرەتای شەقامی رەشید و لەوێوە بڵاوەمان لێ کردووە تا ئۆتۆموبێلێک دیار بووایە، ئەو حەزی نەدەکرد، بپەڕێتەوە هەندێک جار بەزۆر دەستیمان دەگرت و دەمانپەڕاندەوە، دەیوت بەخوا من زۆر لە ماشێن دەترسم.

ماموستا هێمن مرۆڤێکی رووخۆش بوو، هەرگیز بیرم نایەت جارێ لە جاران تووڕە بووبێت، دانیشتنیش لەگەڵ ئەودا، هەمووی باسی شیعر و ئەدەب بوو، دانیشتنێک نەبوو ئەوی تیابێت و باسی شیعر و رۆشنبیری و

ئەدەب نەبێت، بەس دەمی بکردایەتەوە و قسەی بکردایە یەکسەر تۆ هەستت دەکرد خۆشت دەوێ، هەستت پێ دەکرد راستگۆیە و ئەو قسانەی دەیکات لە ناخی دەروونەوە دەیکات، جارێکیان پێی وتم، لەتیف مژدەیەکم بۆت هەیە، وتم، چییە؟ وتی، دوو شیعرت لە کۆوارێکی فارسیدا بە ناوی (دنیا) بڵاو بووەتەوە کە برایانی توودە دەری دەکەن، ئێستاش کۆوارەکەم لایە، کۆوارەکە چاپێکی ئاساییە، شیعری من و نازم و حیکمەت و چەند شاعیرێکی تری تێدایە... هتد، پێم خۆش بوو شیعرەکەم لەو کۆوارەدا بوو و مامۆستا هێمن موژدەیەکی خۆشی پێ دام، بێگومان ئەو کۆوارە بۆ مامۆستا هێمن و برادەرانی ئەو دەهات، چونکە ئەوان نەیاری رژێمی شای ئێران بوون.

بەڕاستی مامۆستا هێمن لەناو لاوانی کورددا بەتایبەتی توێژی خوێندکارانی ئەو سەردەمە زۆر خۆشەویست بوو، لە هەر کۆڕ و کۆبوونەوەیەکدا بووایە، دەبوو بە چەپڵەڕێزان دەگەیشتە ئەوەی مەترسی پەیدا بێت و پیاوانی رژێم، خۆیان هەڵقورتێننە فیستیڤاڵ و کۆڕەکەوە.

## محەمەد عومەر عوسمان

* لە شیعرێکی ناو دیوانەکەتدا، ناوی محەمەد عومەر عوسمانت بردووە، ئەویش دیوانێکی جوانی هەیە (لە غوربەتدا) و وەرگێڕراوە بۆ چەند زمانێکی بیانی، چۆن شیعرەکانی هەڵدەسەنگێنی؟

- محەمەد عومەر عوسمان بەڕاستی بیڵێم، دەنگێکی جیایە لە شیعری کوردیدا، دەنگێکە خەسڵەتی تایبەتیی خۆی هەیە، هەر خۆشی کە لە رێگەیەکدا دەیبینی، دەبینی کەسێکی تەنیایە، من کە ناوی محەمەد عومەر عوسمانم لەو شیعرەدا بردووە، ویستوومە خۆشەویستیی شیعری خۆمی بدەمێ و ناوی گەلێ برادەری خۆشەویستی خۆمم لە شیعرەکانمدا بردووە حەز دەکەم، ئەوانەی کە بەداهێنەریان دەزانم جاروبار لە شیعرەکانمدا ناویان بهێنم.

شیعرەکانی محەمەد عومەر عوسمان، من ناتوانم وەکو رەخنەگرێک هەڵی

سـەنگێنم، بەڵام من وەکو زەڕنگەر چۆن زێڕ دەناسێ، ئاوا شـیـعـر دەناسم، شیعرەکانی بە چاوی شیعری بەرز، تەماشـای دەکەم و دەنگێکە وەکو وتم، خەسڵەتی تایبەتیی خۆی هەیە و هیوادارم نەوەستابێت و لەمەودوای تەمەنیدا شیعری جوانترمان پێشکێش بکا.

* وەکو چۆن بەرهەمە کوردییەکانت وەرگێڕراوەتە سەر زمـانەکانی تر، ئەی ئەو کتێبانەی بە عەرەبی نووسیوتن وەرنەگێڕراون بۆ سەر زمانەمانی تر؟

– ئەو کـتـێـبـە عـەرەبییـانەی هەمـە، زیاتر لە کـوردییـەکـانمەوە کـردوومن بە عەرەبی، لەبەرئەوە پێویست ناکات جارێکی تر بکرێنەوە بەکوردی.

* بۆ سەر زمانی تر.

– بۆ زمانی تر، نازانم تـا بیکەم بەزمانی تر، بە قسەکردن بێجگە لە کوردی و عەرەبی تورکمـانیش دەزانم و بە خوێندەنەوەش نەختێک فـارسی دەزانم، ئیتر زمانی تر بەو جۆرە نازانم، بەرهەمی پێ وەربگێڕم.

* ئەگـەر ئێسـتـا تەمـەنت بگەڕێتـەوە بۆ سـاڵانی حـەفتـاکـان چی دەکەی؟ ئەو ساڵانە چیت نەکردووە و خۆزگە دەخوازی بتکردایە؟

– ئەو کاتە کـاتێکی سەرشێتـیی ڕۆشنبـیریم بوو، سـەرشێـتـیی یاخـیبوونە ئەدەبییەکانم بـوو، وا دەزانم شتێک نەمـا، نەیکەم و بە جـوانیش دەوری خـۆمم بینی، بەڵام یەک شت دەڵێم، ئەوسـا ڕۆشنبـیـران و خـوێنەری کـوردیش لەو ئاستـەدا نەبوون بزانن، ئەو کردەوە و یاخیبوونەی من ئەنجامم دەدا چی بوو، هەر بۆ نموونە کاتێک کە جلێکی سەیرم لەبەر دەکرد، یان بە جۆرێک سـەرم دەتاشی بە جـۆرێک کـە لەو سـەردەمـەدا نـەدەتاشـران، ئەوسـا تەنیـا هـەر خـۆم بووم و ئەوان بەشێتیان دەزانیم.

* ئەی لە رووی رۆشنبیرییەوە؟

– ئەوەش هەر ئیشێکی رۆشنبیری بوو، چونکە ئەگەر ئاستی رۆشنبیریم لە ئاستێکی یاخیبووندا نەبووایە من نەدەچووم سەرم بەجۆرێک بتاشم کە هیچ کەسێک وا سەری نەتاشیبێت ئەوەش، دەخەمە پاڵ ئاستێکی رۆشنبیری، یان جلوبەرگێکم لەبەر دەکرد هیچ کەسێک لەبەری نەدەکرد ئەوەش هەر دەخەمە ئاستێکی رۆشنبیرییەوە، چونکە ئەگەر رۆشنبیرێتیم لەو ئاستەدا نەبووایە من ئەو جلوبەرگەم لەبەر نەدەکرد، بەڵام بەداخەوە ئێستا کۆمەڵگەکەمان دوا مۆدێلی جلوبەرگ لەبەر دەکەن، بەڵام لە رووی رۆشنبیرییەوە لە ئاستێکی زۆر نزمدان، یەعنی لە ئاستی سالانی چلدایە، کتێبێکی نەخوێندووەتەوە، بەڵام ئاخر مۆدێلی قژ داهێنان و قژ نیگرۆکردن و ریش تاشین دەکات، وەلاهی من بۆ کورِ و کچ لەگەڵ ئاخر مۆدێلدام، کورِ حەزی لە ملوانەکەیە با لە ملی بکا و حەزی لە بازنە با بیکاتە دەستی، کچێکیش تەنانەت حەز دەکات بە رووتی بێتە دەرەوە با بەرِووتی بێتە دەرەوە، بەڵام لەو ئاستە رۆشنبیرییەدا بێت کە بزانێ مەبەستی لەو کارە چییە؟، نەک ئاخر مۆدێلی جلی لە بەردا بێت و عەقڵی لە ئاستی سالانی چلی سەدەی بیستدا بێت و کتێبێکی نەخوێندبێتەوە و کۆوارێکی نەخوێندبێتەوە و لە هیچ شتێک نەزانێت تەنیا و تەنیا شەو و رۆژ بکاتەوە و ئاستێکی رۆشنبیریی نەبێت، هەموو یاخیبوون و گۆرِانکارییەک دەبێ رۆشنبیریی لە پاڵدا بێت، ئەو گۆرِانکارییانەی کە ئێستا لە کۆمەڵگەکەی ئێمەدایە بازدانە و رۆشنبیریی لە پاڵدا نییە، گۆرِانکارییەکانی سالانی حەفتای گرووپی روانگە و گرووپی کفری و هەروەها پێشرِەوی هەولێر (عەباس عەبدولا یووسف و ئەنوەر مەسیفی و ئەوان) رۆشنبیریی لە پشت بوو، هەروا بەهەوانتە و لەخۆرِا نەهاتە کایە، بەڵام گۆرِانکارییەکانی ئێستا بێ بنەمایەکی رۆشنبیری هاتووەتە کایەوە، هەرچیش بێ بنەما بێتە کایەوە بەبێبنەما سەرنگوون دەبێت، بەڵام سەیر دەکەی جێدەستی گرووپی کفری و روانگە و پێشرِەوانی هەولێریش دیارە، من وەکو گرووپ نایلێم وەکو

کەسایەتی دەیڵێم وەکو چەند کەسێک لە گرووپی کفری و چەند کەسێک لە روانگە و چەند کەسێک لە گرووپی پێشڕەودا جێدەستیان دیارە، ناڵێم هەموویان، حزبایەتیش هەروایە، لەناو حزبێکدا هەرچەند کەسێک هەڵدەکەوێت و جێدەستیان دیارە، ئەوانیتر هەر پاشکۆن، ناتوانن بگەنە ئاستێک لە سیاسەتدا دەرکەون، لە گرووپیشدا هەروایە، لە گرووپێکدا پەنجا کەس بێت هەر چواری شاکاری هەیە، ئەگەر پاڵپشتیی رۆشنبیری نەبێت، هیچ گۆڕانکارییەک سەر ناگرێت و وەکو بەفری هاوین زوو دەتوێنەوە.

* ئەگەر داوات لێ بکەن ببیت بە مامۆستای ئەدەبی کوردی لە یەکێک لە زانکۆکانی کوردستاندا، وەڵامت چی دەبێت؟

– ئەوسا جێگەکەم بچووک دەبێتەوە، من ئێستا خۆم بە مامۆستای شیعر دەزانم لە سەرجەمی جوگرافیای شیعری کوردیدا، بە بۆچوونی من ئەکادیمییەت لە دەقدا نییە، لە رۆماندا نییە، لە شیعردا نییە، لە چیرۆکدا نییە، لە رەخنەدا نییە، هەر بۆ نموونە رەخنەگرێک کاتێک دەچێتە هۆڵێکی زانکۆوە وانەی رەخنە بە قوتابییەکان دەڵێتەوە، بوارەکەی تەسک دەبێتەوە، ناچار دەبێت بۆ کۆمەڵێ قوتابی ئیش بکا، بەڵام کاتێک کە وتارێکی رەخنەیی دەنووسێ، یان کتێبێکی رەخنەیی دەنووسێت، جوگرافیایەکی بەربڵاوی لە بەردەستدایە، جوگرافیای نەتەوەیەک، چونکە بۆ نەتەوەیەک دەنووسێ، بەڵام کە دەچێتە هۆڵی کۆلێجێکەوە، یان پەیمانگەیەکەوە بۆ ئەو گرووپە دەنووسێ و قسە دەکات، بەبۆچوونی من، ئەوە بچووککردنەوەی خاوەنی دەقە چ رۆماننووس، چ چیرۆکنووس و چ رەخنەگر.

* ئەی ئەگەر ئێستا کەسێک، شیعرێکی کلاسیک بنووسێت؟ تۆ چی، پێ دەڵێی؟

– شیعری کلاسیکی نەمردووە، خۆ هێمن شیعری کلاسیکی دەنووسی، زۆر کلاسیکی، خوێنەریشی زۆر بوون.

* چۆن رۆمانسییەت هات و کلاسیکی وەلا نا و پاشان نوێگەری لە سەرتاپای شیعری جیهاندا سەری هەڵدا بە شیعری کوردییشەوە، هەموو قەتابخانەکانی تری وەلا نا.

- باوەڕت هەبێت هەرچی شێوازی شیعری و رۆماننووسین و چیرۆکنووسین هەیە، ئێستاش تازە داهاتووە و هەندێکیان کۆن دەبێت، بەڵام هەمووی دووبارە دەبێتەوە، کاتێ ئەحمەدی خانی شیعری نووسیوە، دوو بەیتی نووسیوە شیعری کلاسیکی و یەک قافیەی نەنووسیوە، ئاڤێستا بەیەک قافیە نەنووسراوە، بە دوو بەیت نووسراوە، بەڵام ئێمە لە دوای ئەحمەدی خانی شیعری کلاسیکمان نووسیوە، نالی یەک قافیەی نووسیوە، هەر لەو ماوەیەدا شیعری رۆمانسی دوو بەیت وەکو مەولەوی و سەیدی هەورامی و وەلی دێوانە، ئەمانە شیعری دوو بەیتییان نووسیوە، خۆ شیعری کلاسیکی نین، لە فارسیشدا شیعری یەک قافیە و دوو بەیت (مەسنەوی) هەیە، جەلالەدینی رۆمی مەسنەوییەکانی بە دوو بەیت نووسیوە، بەڵام لە هەمان کاتدا شیعری کلاسیکی کە بەیەک قافیە نووسیویەتی، شیعری زۆر زۆری هەیە، هێمن شیعری کلاسیکی هەیە و شیعری نوێشی هەیە / ساقیا وا با دەوە وا با دەوە / روو لەلای من کە بە جامێ باداوە / یەکێکە لە شیعرە هەرە گەورەکانی رۆهەڵات، بەبۆچوونی من شیمبۆریسکا کە خەڵاتی نۆبڵی وەرگرتووە دەبووایە نەدرایە بە ئەو بدرایە بە هێمنی موکریانی بۆ ئەو شیعرەی، ها من ناشخۆمەوە.......

* ئەی جگەرە دەکێشی؟

- بەڵێ لەو کاتەوە کە پەرلەمان جگەرەی قەدەغە کردووە، جاربەجار هەفتەیەک دوو جگەرە سێ جگەرە، دەکێشم هەر لە داخی پەرلەمان، چونکە ئیشی پەرلەمان نییە خۆی هەڵقورتێنێتە کاروباری ئازادیی خەڵکەوە و جگەرەی لێ قەدەغە بکا، خۆ کێشەی تر زۆر بوو، پەرلەمان خۆی پێوە خەریک

بکا، نەک کێشەی جگەرە، ئێستاش خۆی بەکێشەی موبایلەوە خەریک کردووە، ئێ باشە ئەگەر کچ و کوڕێکی گەنج مۆبایلیان بۆ دڵداری نەبێت، ئیتر بۆچییانە، دەبووایە پەرلەمان، خۆی بە کێشەی دەستوور و کێشەی کەرکووک و خانەقینەوە خەرک بکردایە خۆی بەکێشەی ئەو لاوانەوە خەریک بکردایە ئەو دەرچووانەی زانکۆ پەیتا پەیتا خوێندن تەواو دەکەن و ئێشیان نادرێتێ، یان لەوە بکۆڵیایەتەوە کە بۆچی لاوانی کورد کوردستان بەجێ دەهێڵن، کە ئێستا سیستەمەکە سیستەمێکی کوردییە و لە کاتێکدا کە ئیسماعیل بێشکچی دەڵێت، کە دۆستێکی گەورەی کوردە و هەموو ژیانی خۆی لەسەر کورد لە بەندیخانەکاندا بەسەر بردووە دەڵێ، خراپترین ڕێژیمی کوردی لە باشترین ڕێژیمی بێگانە باشترە ئەمە ئیسماعیل بێشکچی دەیڵێ، خۆ ئەم ڕێژیمەی کە هەیە بە ویژدانەوە دەیڵێم، خراپترین ڕێژیم نییە لەمە خراپتریش هەیە، ئەم ڕێژیمە لایەنی باش و لایەنی خراپیشی تیایە، ئەی باشە کە خراپترین ڕێژیمیش نییە، بۆچی لاوانی کورد پەیتا پەیتا کوردستان بەجێ دەهێڵن، یان زانکۆ تەواو دەکەن و بێ کار دەبن، من کۆمەڵێ خوێندکاری زانکۆ دەناسم، کە زۆر هەستی ئەدەبییان هەیە و جار بەجار بەیەکەوە دادەنیشین و حەز دەکەن باسی شیعر بکەین، وتم، کە زانکۆ تەواو بکەن، ئیشەڵڵا پاشەڕۆژێکی ڕووناکتان دەبێت، وتیان وەڵا زانکۆ تەواو بکەین، دەچینە دەرەوە، ئێمە لە کوردستاندا جێمان نابێتەوە، دەبووایە پەرلەمان بەم کێشانەوە خۆی خەریک بکردایە، نەک بە کێشەی موبایل و جگەرەوە، وەڵا من لە داخی پەرلەمان جگەرەش دەکێشم.

لەسەر مەسەلەی شیعری کلاسیکیش، حەز دەکەم ئەوە بڵێم کە شیعری کلاسیک نامرێ و مۆدێلی جل و قژیش نامرێ، ئەم مۆدێلی قژەی ئێستا هەیە ئەمە لە ساڵانی پێشوودا هەبووە و ئێستا دووبارە دەبێتەوە، مەسەلەن پۆست مۆدێرنیزم چییە؟ تازەکەرەوەی مۆدێلە کۆنەکانە ئەوە نەبێت بازدانێکی گەورە بێت، ڕۆژێک لە ڕۆژان لە شێوەکاریدا بەرەو کلاسیک دەگەڕێینەوە لە ڕۆمانیشدا بەرەو کلاسیکییەت دەگەڕێینەوە، زۆر زۆر شتێکی ئاساییە،

ئێستا ئەگەر شاعیرێک هەبێت وەکو هێمن و نالی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی، بنووسێت بەهەمان هێزی ئەوانەوە، من ڕێزی لێ دەنێم و وەکو شیعری نوێی باش دەیخوێنمەوە، بۆچی شیعری نوێ هەمووی باشە؟ شیعری نوێش لە سەدا بیستی، یان لەسەدا بیست و پێنجی، دەتوانم دانی پیا بنێم کە شیعری باشە، ئەوانی تریان قسەی ڕۆژانەیە، تەنانەت هی ئەو شاعیرانەش کە خەڵک دەیانخوێنێتەوە کە وتم لە سەدا بیست و پێنج زۆرم وتووە، ئەگەر بمەوێت خۆم نەخەڵەتێنم لە سەدا پازدەیم بەدڵە و ئەوانی تر قسەی قۆڕن.

* ئەگەر بتکەن بە بەرپرسێکی حکوومی رازی دەبیت، یان نا، بۆچی؟

– کورە بە قورئان رازی نابم، وەڵا وەبیلا وەتەلاهی ئەوەم پێ خۆشترە دەرم بکەن لە کارەکەم و مەعاشەکەم ببڕن، لەوەم پێ خۆشترە بەرپرسێکی حکوومی بم، من شاعیرم، شاعیر چۆن دەتوانێ بەرپرس بێت، وەکو پێشتر وتم، ئەو ساڵە سیدار سەنگور سەرۆک کۆماری سەنگال بوو، دەستبەرداری کارەکەی بوو، چونکە وتی، من ناتوانم شاعیرێتی و سەرۆک کۆمارێتی پێکەوە بکەم، ئەمە حاڵەتێکی زۆر زۆر جوان بوو.

## مردن و پەیکەر

* دەزانم زۆر رقت لە مردنە، ئەگەر دوای مردنت پەیکەرێکت بۆ دروست بکەن، پێت خۆشە ئەو پەیکەرە لە کوێ دابنرێت؟

– من پێشنیاز دەکەم بۆ داهێنەران، داهێنەری هەموو بوارەکان بە زیندوویێتی پەیکەریان بۆ بکەن، پەیکەرەکە بەلای کەمەوە ئەو کەسە گەیشتە تەمەنێکی دیاریکراو پێش مردن، ئەو پەیکەرەی بۆ بکرێت، رەنگە پێی خۆش بێت و لەزەتێک لەوە ببینێت، من شتێکم بیستووە، مرۆڤ شتێکی پێ خۆش بێت لە لەشیدا جۆرە ئەنزیمێک پەیدا دەبێت کە دەبێتە مایەی تەمەندرێژیی هەر

چەندە تەمەن بەدەست خوایە، تۆ کارێکی خێرخوازی دەکەیت کەسێک دڵخۆش دەکەیت خۆشت دڵت خۆش دەبێ، جەستەت ئەنزیمێک دروست دەکات کە دەبێتە مایەی تەمەندرێژی، تەمەندرێژی بە دەست خوایە، ئەو ئەنزیمەش هەر لەلایەن خواوە دروست دەبێ.

کاتێک پەیکەرێک بۆ داهێنەرێکی هەر بوارێک دەکەیت، من لەو باوەڕەدام ئەوەندە دڵی خۆش دەبێت رەنگە دە ساڵ تەمەنی درێژ بکا، داهێنەران پێیان خۆشە، پێش مردن رێزیان لێ بگیرێ، وەلایی دوای مردن چ پەیکەری بۆ بکەی چ گۆڕەکەی بسووتێنی، گرینگ نییە بەلایەوە، ئەگەر لە بەهەشتدا بێت لە بەهەشتایە و لە جەهەننەمیشدا بێت لە جەهەننەمدایە، ئەم دنیایەی بەلاوە گرینگ نییە، ئێستا شاعیرێک لە ناخۆشترین ژیاندا بژی و کە مردیش پەیکەری بۆ دروست بکەن، ئەمە هەلپەرستی ئەو سیستەمی فەرمانڕەواییەیە و هەلپەرستیی ئەو گەلەشە کە بەزیندوویتی لا لەو داهێنەرە ناکاتەوە، کورد زوو وتوویەتی، ئێمە زیندووکوژی مردووپەرستین.

* بەلام وا بزانم ئەوەش شتێکی جوانە ئەو داهێنەرە تا زیندووە و لە ژیاندایە، ئەوە خۆی لەناو خەڵکدایە و باس دەکرێت، دروستکردنی پەیکەریش بۆی دوای مردنی هەنگاوێکە بۆ ئەوەی دوای مردنیشی هەر بەزیندوویەتی بمێنێتەوە؟

- لە کوردەواریدا شتێک هەیە دوو کەس، یان دوو برا ناکۆک بن، ئەگەر ئەو کەسە نەخۆش کەوت و نەچوو بۆ لای، ئەگەر ئەو کەسە خوانەخواستە مرد، کەسوکارەکەی دەڵێن مادام بە زیندوویەتی نەهات، بۆ لای با بەمردوویەتییش نەیەت بۆ تەعزییەکەی، چونکە ئەو بەزیندوویەتی نەهات بۆ لای و سەردانی نەکرد و ئاشتی نەکردەوە با بەمردوویەتییش نەیەت، منیش دەڵێم هەر داهێنەرێک بەزیندوویەتی رێزی لێ ناگرن و پەیکەری بۆ ناکەن، ئەی فەرمانڕەوا و نەتەوەی کورد، بەمردوویەتییش هەقتان نەبێت بەسەریەوە.

* له شیعرێکتدا دەڵێی: له زمانی تاشەبەرد بزانی/ له تام و چێژی بێدەنگی مەست مەست دەبی/ لەو هەموو گفتوگۆیه بێزار نەبووی کە ماوەیەکە سەرقاڵین، پێوەی له هەمان کاتدا تۆ لەو کۆپله شیعرەتدا باسی تام و چێژی بێدەنگی دەکەیت؟

– بێدەنگی کاتی خۆی هەیه، قسەکردن کاتی خۆی هەیه، کاتێک کە کاتی قسە بێت، نەیکەیت ترسنۆکی، کە کاتی بێدەنگییش بوو، قسە بکەی ئەوە نەزانی، کورد دەڵێ، بەرد له جێی خۆی سەنگینه، منیش دەڵێم بێدەنگی له جێی خۆیدا سەنگینه، هەروەها قسەکردنیش له جێی خۆیدا سەنگینه، کە لەو شیعرەدا باسی جوانیی بێدەنگی دەکەم، ئەو کاته جێگەی بێدەنگی بووە، جێگەی ئەوە بووە کە بێدەنگ بم، زۆرجار ئەو کاتەی کە حاڵەتێکی شیعری دەمگرێت حەز دەکەم بێدەنگ بم بەدرێژاییی ئەو حاڵەته شیعرییه، ئەگەر ئەو بێدەنگییه له دەست بدەم، حاڵەته شیعرییەکەم له دەست دەدەم و شیعرەکە له مێشکمدا بەرجەسته نابێت و دوای شیعرەکە لەدایک نابێت، من باسی جوانیی ئەو حاڵەته شیعری و بێدەنگییه دەکەم، حاڵەتی شیعرییش کات و مێژووی نییه و چوارچێوەشی نییه، لەبەرئەوە من لەوێدا کات و چوارچێوە و مێژووەکەیم دیاری نەکردووە، حاڵەت و بارودۆخێکی بەردەوامه، وەکو مردن و ژیان، بارودۆخی ژیان نه وەکو سنوور دیاری دەکرێت و نه وەکو چوارچێوەش دیاری دەکرێت، حاڵەتی بێدەنگییش حاڵەتێکی بەردەوامه، وەکو مردن و ژیان، دەتوانم بڵێم، چوار شت لای شاعیر بەردەوامییان هەیه، من خۆم وام (مردن و ژیان، بێدەنگی و شیعر) ئەم چوارە پێکەوە دەمرن و زیندوو دەبنەوە.

## نووسینەوەی بیرەوەری

* جارێک گوێم لێ بوو، باسی نووسینەوەی بیرەوەرییەکانت دەکرد، تا ئێستا چەندت لێ نووسیوەتەوە؟ چەندت ماوە؟

– من له بیرەوەریدا، شته زۆر گرینگەکان دەنووسم، حەزیش ناکەم بیرەوەری

وەکو قسەیەکی ئاسایی بنووسمەوە، هەوڵم داوە بیرەوەرییەکانم شیعری بێت، من کاتێک بیرەوەرییەکانم لە رۆژنامەی خۆرنەوەزاندا کە لە کفری دەردەچوو بڵاو دەکردەوە نێزیکەی بیست زنجیرەم بڵاو کردەوە، لەوێ وا بزانم ساڵی ٢٠٠٤ – ٢٠٠٥ بوو، خەڵکی زۆر بەدەمییەوە چوون و زۆریان بەدڵ بوو، بە تەلەفۆن و بەبینین، کاتێ دەمبینین زۆر پیرۆزباییان لێ دەکردم تەنانەت یەکێک لەو برادەرانە برای زۆر بەڕێز و خۆشەویستم کاک تەیب جەبار وتی، ئەگەر بتەوێ بڵاوی بکەیتەوە تەواوت کرد من ئامادەم لەسەر ئەرکی خۆم چاپی بکەم، ئەوەش زیاتر هاندانێک بوو بۆ من، دواتر برادەرانی کۆواری لڤین بینیانم، بەتایبەتی لە پێش هەموویانەوە، شەهیدی جوانە مەرگ سۆرانی مامە حەمە، کاتێک کە لە کۆمەڵەی رووناکبیری بووم لە کەرکووک بینیم هات وتی، حەز دەکەین ئەو بیرەوەرییانەت، دووبارە بکەینەوە لە لڤیندا من پێم خۆش بوو، کاتێک کە لە لڤینیش بڵاو بووەوە، خەڵکی زۆر دەیانخوێندەوە و دەستخۆشییان لێ دەکردم و تەلەفۆنیان بۆ دەکردم، تەنانەت برای بەڕێز و خۆشەویستم شاعیر و رۆژنامەنووسی ناسراو، کاک یاسین عومەر، وتی ئەم بیرەوەرییانەت ئەوەندە بەتام و لەزەتە و بەشێوازێکی وا سیحری نووسیووتە وای لێ کردم بە دیوانە شیعرییەکان و نووسینەکانتدا بچمەوە و بیروڕای نوێ لەبارەیان گەڵاڵە بکەم، من ئەوە نانووسم یەکێک بیرەوەرییەکانی بنووسێت، لە فڵان سەیارەدا جگەرەیەکی کێشاوە و لە فڵان شوێن برادەرێکی ناسیوە و... هتد من ئەوەی گرینگ نەبێت و پێوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە بواری رۆشنبیرییەوە نەبێت، تۆمارم نەکردووە و تۆماری ناکەم، ژیاننامەی ئاسایی نانووسمەوە، چونکە ژیاننامەی ئاسایی زۆر بووە و خەڵکی بێزارە لە خوێندنەوەیان، دەمەوێ شتگەلێک بنووسم پێوەندییان بە ژیانی رۆشنبیری رۆژانەی هەموو رۆشنبیرێکەوە هەبێت، خەریکم کۆیان دەکەمەوە، رەنگە بگاتە بیست و پێنج زنجیرەیەک، یان کەمتر لە سنووری ٢٠٠ بۆ ٢٥٠ لاپەڕەیەکدا بێت و دەمەوێت تا ساڵی ٢٠١١، پشت بە خوای گەورە، چاپی بکەم.

* با بێینه سەر هەندێک پرسیاری دوور لەو بابەتانەی باسمان کرد، دەمەوێ هەندێ پرسیاری تایبەتیت لێ بکەم، بۆ نموونە حەزت لە چ جۆرە گۆرانییەکە؟

– حەزم لە گۆرانییە کلاسیکییەکانە وەکو سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی و عەلی مەردان و سێوە و خوداد عەلی و حەسەن زیرەک، ئەم دەنگانە سەرنجم ڕادەکێشن، حەزم لە گۆرانیی شەماڵ سائیبیشە، بەتایبەتی شوانە هۆ شوانە و هەرە لەیلێ و ئازیز بەهارە و کیژۆڵەی شاری کۆیە، بە ڕاستی شەماڵ سائیب بە گۆرانیبێژێکی داهێنەر دەزانم، جێی خۆی بوو لە سلێمانیدا شەقامێک بە ناوی ئەوەوە بێت، یان پەیکەرێکی بۆ ساز بکرێت، بەڵام بەداخەوە تا ئێستا نەکراوە.

* ئەی حەزت لە چ جۆرە فیلمێکە؟

– من هەر لە منداڵییەوە حەزم لە فیلمی پاڵەوانبازی و شەڕ و ئەو شتانە بووە، ئێستاش حەزم لە فیلمی کاوبۆی ئەمەریکاییە، لە تەلەڤزیۆنەکانی کوردستان، لەو جۆرە فیلمانە زۆر بەدەگمەن پیشان دەدەن، خۆزگە ئەم داوایەمیان قبووڵ دەکرد و هەفتەی جارێک، یان دووجار فیلمی کاوبۆی ئەمەریکییان، پێشکێش دەکرد، ئەوە ئارەزووی هەمیشەییمە بۆ فیلم.

* چ وەرزێکی ساڵت بەلاوە خۆشە؟

– وەلایی خۆشترین وەرزی ساڵ لام زستانە، چونکە مژدەی بەهار دەدات، ناخۆشترین وەرزیش لام هاوینە، چونکە مژدەی پایز و گەڵاڕێزان و وەرینی گوڵ و ناخۆشی دەدات.

* خۆشترین بیرەوەریی منداڵیت چییە، ئەگەر ئێستا لە بیرت بێت؟

– خۆشترین بیرەوەریی منداڵیم، ئەو ڕۆژە بوو کە چووم بۆ قوتابخانە،

برادەرێکم هەبوو ناوی بەهزاد قادر بوو لە گەڕەکەکەماندا، رۆژێکیان ویستم یاریی لەگەڵ بکەم، وتی باوکم دەمبات بۆ مەکتەب، دەچین قەیدم دەکات (ئەوسا وایان دەوت)، منیش چوومەوە بۆماڵەوە، وتم منیش دەچم بۆ مەکتەب، ئیتر منیشیان برد بۆ مەکتەب، قژم بەقەدەر قژی دەروێشێک درێژ بوو، بۆیە بەڕێوەبەرەکە بە باوکمی گوت، یا شێخ نابێت بەم قژەوە دەوام بکا، ئیتر باوکم بردمی بۆ سەرتاشخانەیەک لە کفری و قژیان تاشیم، ئەوە بیرەوەرییەکی خۆشی منداڵیمە.

* ئەی ناخۆشترین بیرەوەریی منداڵیت؟

- ناخۆشترین بیرەوەریی منداڵیم زۆرە، بەڵام ناخۆشترین شت ئەوە بوو و هەرواش بوو و واش بیر دەکەمەوە، هەندێ قوتابیم دەبینی دەوامیان دەکرد جلەکانیان پینەی پێوە بوو زۆرم بەلاوە ناخۆش بوو، بەلێکدانەوەی منداڵیی خۆم پێم ناخۆش بوو، ئەو منداڵانە هەژار بن و جلەکانیان پینەی پێوە بێت.

* خۆشترین بیرەوەریی سەردەمی هەرزەکاریت چییە؟

- جارێکیان نامەیەکم نووسی، بۆ کچێک هەرچیم دەکرد نەمدەوێرا بیدەمێ، ئێستاش بیرم دەکەوێتەوە، پێکەنینم دێت، تا دوای دوو ساڵیش نامەکەم مابوو هەر دەمبینی و نەمدەوێرا بیدەمێ، ئەو کچە لە کفری بوو و ئەوە یەکەم کچیش بوو کە هەستی بزواندبووم، کە نامەکەش فەوتا، زۆرم پێ ناخۆش بوو.

* دیارە بیرەوەرییەکانت هەمووی بیر ماوە، ئێستا بیرەوەرییەکی ناخۆشی گەنجێتیتم پێ بڵێ.

- زۆر لاسار بووم، رۆژێکیان چەکوشێکم بە دەستەوە بوو بزمارێکم دادەکوتا بە دیوارێکدا، خوشێککم لە خوار ئاستی ئەو بزمارەی دەمویست دای کوتم بە دیوارەکەدا نووستبوو، چەکوشەکە لە دەستم بەربووە و دای بەسەری خوشکەکەمدا شکاندی.

* ئەو کەسایەتییانەی لە مێژوودا رۆڵیان بینیوە و تۆ پێیان سەرسامیت؟

- کەسایەتیی مێژوویی زۆر زۆرە، من سەرسامم بە ئەسکەندەری مەکدۆنی کە لە تەمەنێکی زۆر کەمدا بیری لەوە کردووەتەوە ئەو جیهانگیرییە بکا کە ئێستا دەوڵەتێکی زلهێزی وەکو ئەمەریکا ئێستا بیری لێ کردووەتەوە، بەهەموو جۆرێک ناتوانێت بیکات، ئەو بەتەمابوو ئەوە بکا، ئەسکەندەری مەکدۆنی بەلای منەوە کەسایەتییەکی زۆر گەورەیە و پێی سەرسامم.

* ئەو کتێبانەی کە کاریگەرییان هەبووە لەسەر ژیان و نووسینت؟

- ئەو کتێبانە زۆر زۆرن، دەتوانم بڵێم هەر قۆناخێک و کتێبێکیش، لە قۆناخی منداڵیمدا کە دەستم کرد بەخوێندن لە دوازدە سێزدەساڵیدا، کتێبەکانی جەبران خەلیل جەبران بەتایبەتی کتێبەکانی (المجنون، النبي) دەورێکی بالآیان بینی لە ژیانمدا.

* ئەم شارانە لای تۆ چی دەگەیەنن؟ کفری- کەرکووک - سلێمانی - بەغدا.

- کفری جێ زای شیعری نوێ، کەرکووک، دڵدارییەکی سەرگەرمانە لەگەڵ شارەکە و لەگەڵ کچێکیشدا کە خۆشم ویست و دڵدارییەکەش جوانەمەرگ بوو، سلێمانییش، خۆشترین شاری جیهانە، بەغدا شاری رۆشنبیری و ئەو شارەیە کە هەموو کتێبەکانی جیهانی پێ ناساندم، واتە باشترین کتێبگەلێک کە ئاشنایان بووم و شارەزایان بووم و بوون بە هاورێم لە شاری بەغدادا دەمکرین.

* پێوەندیت لەگەڵ نووسەران و هونەرمەندانیدا چۆنە؟

- ساڵانی حەفتا هاتوچۆ زۆربوو لەناو نووسەراندا، فیستیڤاڵ و کۆڕی

رۆشنبیری زۆر بوو، لەسەر مێزی وشەی پیرۆزی کوردی سەدان نووسەرم لە زاخۆوە تاکو بەغدا و مەندەلی و خانەقین ناسی، بە داخەوە لەسەر مێزی سیاسەت، ئەو دۆستایەتی و برادەرییەی کە لەسەر مێزی وشەی کوردیدا دروست بوو هەمووی لەسەر مێزی سیاسەت پرش و بڵاو بووەوە.

* جگە لە شیعر چ هونەرێکی تر سەرنجت ڕادەکێشێ؟

– رۆمان بە قەد شیعر، یان زیاتریش سەرنجم ڕادەکێشێت و رۆمانم لە شیعر زیاتر خوێندووەتەوە و ئێستا سەرقاڵی نووسینی رۆمانێکیشم، ئەمە یەکەم رۆمان و دوا رۆمانیشم دەبێت، نامەوێ رۆمانێکی تری بکەم بە سەردا، چونکە وەکو ئەمە سەرکەوتوو نابێت و دڵنیام هیچ رۆماننووسێک دوو رۆمانی زۆر سەرکەوتووی نییە.

* دەتوانی ناوی خۆشەویستێکت بڵێی کە زۆر کاریگەریی لەسەر ژیانت هەبووە؟

– شەهلا.

* ناوی ڕاستەقینەیەتی؟

– ناوی راستەقینەیەتی، بەس. باوەڕ ناکەم کەس بیناسێ، ئەمە خۆشەویستی تەمەنی گەورەییە و زۆر پێوەی پێوەست بووم و لە زۆر شیعردا ناوم بردووە، لە تەمەنی منداڵیشدا، ئەو کچەی کە نەمتوانی نامەکەی بدەمێ، ناوی نازڵی بوو کچێکی تورکمان بوو.

* رقت لە چ دیاردەیەکە؟

– رقم لە شەڕەپەڕۆیە، با بوار رەها بێت، بۆ هەموو کەسێک بە ئازادی بیروڕای خۆی دەرببڕێت.

* چ دیاردەیەکت پێ خۆشە؟

- ئازادی و ئازادی و ئازادی، بەبێ پێوەستبوون بە هیچ لایەنێکەوە.

* زۆر دەخەوی، یان کەم؟

- من زۆرتر بە رۆژ دەخەوم، بە شەو کەم دەخەوم، دەتوانم بڵێم هەموو داهێنان و نووسین و خوێندنەوەشم زۆرجار دەکەوێتە شەو و بەرەبەیان، شەوان تا سەعات دوو و سێ نەخەوتم، زۆرجاریش بانگی بەیانی داوە، نەخەوتووم.

* ئەگەر ببی بە ملیاردێر چی لەو پارەیە دەکەیت؟

- خوا نەکات، بڵێ دوور لەم بەرەوانییە، بەلام باوەڕم پێ بکە، وەلایی پارەیەکی زۆر زۆر کەم بۆ خۆم دەهێڵمەوە، بۆ ئەوەی هەندێ کتێبی خۆمی پێ چاپ بکەم و سەرجەمی کتێبەکانی خۆشمی پێ چاپ بکەمەوە و ئەوەی مایەوە، بەخوا هەر کەسێ بیەوێت دەیدەمێ.

* ئاخۆ شیعر دەتوانێ کێشەکانی ژیانت چارەسەر بکا؟

- نەخێر، ئاخۆ کچێکی جوان دەتوانێ کێشەکانی ژیان چارەسەر بکا؟ شیعریش جوانییە بۆ خۆی، بەلام ناتوانێ کێشەکانی ژیان چارەسەر بکا، نەدەتوانێ نەهێڵێت کەس هەژار بێت، نە دەتوانێ جادەکانمان بۆ قیرتاو بکا، بەخوا نە دەتوانێ بیری ئێرتیوازیمان بۆ هەڵکەنێت، بەلام شیعر دەتوانێ ئاسوودەیی دەروونی ببەخشێ بەوانەی کە دەیخوێننەوە، شیعر دەتوانێ گەلێ نەخۆشی چاک بکاتەوە، زیاتریش نەخۆشییە دەروونییەکان.

* چ کتێبێک بەلای تۆوە نەمرترین کتێبە؟

- بە بۆچوونی من قورئانی پیرۆزە، زۆر دیوانە شیعر و رۆمان و کتێبی

فەلسەفی هەن، دەیان جار خوێندوومەتەوە هەست دەکەم هەندکجار سارد دەبنەوە لەلام، بەڵام قورئان هەر کاتێ دەسی دەیەمێ، بیخوێنمەوە جیهانێکی تازە و تازەتری تیا دەدۆزمەوە و ئەو کتێبەیە کە نامرێ.

* هەژاری خۆشە، یان دەوڵەمەندی؟

- هەژاری ناخۆش نییە، بەڵام نازانم دەوڵەمەندی، نە لە کۆشکدا ژیاوم و نە خاوەنی ریزە بازاڕ و ئۆتۆمۆبێلی ئاخر مۆدێل بووم و نازانم ئەو دەوڵەمەندییەی کە ئێستا بەم شێوەیە هەیە نازانم، باوەڕ ناکەم دەوڵەمەندی خۆش بێت، هەر هەژاری خۆشترە، چونکە کە دەوڵەمەند بووی ئیتر هیچ خەونێکت نامێنێ هەموو خەونەکانت دێنە دی، بەڵام کە هەژار بیت، گەلێ خەونت هەیە و خەون بە دنیایەکی تازەوە دەبینی، بە بۆچوونی من دەوڵەمەندی مردنە، تەواو کۆتاییی ژیانە.

* لە دەرەوەی ئەم پرسیارانە چیت هەیە بیڵێیت؟

- دەڵێم با لێبووردەییمان هەبێت، بەهێزترین کەسانی دنیا ئەو کەسانەن کە لێبووردەییان هەیە، من دڵنیام غاندی لە ئیستیعماری گەورەی بەریتانیا بەهێزتر بوو، غاندی لە ستالین بەهێزتر بوو، غاندی لە هەموو هێزە شەڕخوازەکانی جیهان بەهێزتر بوو، لەبەرئەوە من هەموو کات لێبووردەیی هەڵدەبژێرم و بانگەشەی ئەوە دەکەم کە لێبووردەیی بکەین بە درووشمی ژیانمان، شتە مەعنەوییەکانی ژیان گرینگترن لە شتە مادییەکانی ژیان، تۆ ناتوانی بێ خۆشەویستی بژیت، بەڵام دەتوانی بێ پارەی زۆر و کۆشک و ئۆتۆمۆبێل بژیت.

* پێت خۆشە، ئەم دیدارە بەچ ناوونیشانێک بڵاو بکەمەوە؟

- جارێ نازانم، جارێکیان دیدارێکی نزار قەبانیم خوێندەوە، دەڵێن تۆ چۆن ناوونیشان بۆ کتێب دەدۆزیتەوە؟ لە دیدارەکەدا دەڵێ، جاری وا هەیە

ناوونیشانەکەیم نووسیوە و چووە بۆ چاپیش، بەپەلە دەچم بۆ چاپخانە و ناوونیشانەکە دەگۆڕم، منیش وام، جاری وا هەیە، پێش چاپ ناوونیشانی شیعرێکم، یان ناوونیشانی دیوانەکەم دەگۆڕم، لەبەرئەوە نازانم بڵێم، بە چ ناوونیشانێک، حەز دەکەم بڵاوی بکەیتەوە؟.

سیمین چایچی، هاژە کلاوێ، لەتیف هەڵمەت

حوسێن، لەتیف هەڵمەت، هشام تاهیر بەرزنجی

لەتیف هەڵمەت،
ناوەندی شەستەکان

مامۆستا سەلاحی
پەرلەمان،
لەتیف هەڵمەت

لەتیف هەڵمەت، چایخانەی کەمال چایچی، کفری،
ناوەندی شەستەکان

لەتیف هەڵمەت، شەمێران سلێمان

هەڤاڵ کوێستانی، لەتیف هەڵمەت، عەبدولقادر جەباری،
بەغدا، ناوەندی شەستەکان

لەتیف هەڵمەت،
کفری ١٩٦٧

برلين – السبت
٢/١٢/٦٦

أخي العزيز

كم كانت غبطتي عظيمة وفرحتي عميقة عندما استلمت رسالتك الأخيرة التي بعثت في نفسي بهجة الذكريات.

وواجهتني صفحتها الأولى مشرقة باسمة طافحة بنفحات الشذى العبقة وملأت صدري ونفسي منتشياً من ذلك الشؤبوب العارم يقبّلْ الشوق والحنان ومشاعر الأخوة الصادقة، وكأن أسراب السنونو تترى على غادية ورائحة حاملةً بين جناحيها أسمى سمات المحبة والامتنان مقدمة إلى باقات التحايا العطرة التي أمطرتها على كواهل شمعٍ سكوبْ.

إن الأحاسيس الأخوية المنبثقة من أعماق الصفاء والإخلاص تلك التي تربط بين قلبينا التواقين إلى العناق الأبدي والسعادة الغامرة التي تشكر النفس الانسانية وترتفع بها إلى أجواء من فوق عالم المادة والمحسوسات.. إلى عالم يسوده الحب حيث خلود الروح وسموّ العواطف وتجسيد الأماني النبيلة للانسان الطيب النبيل المحب لأخيه الانسان.

أقول .. كم كانت غبطتي عظيمة عندما تراقصت أمام ناظري الأسطر الأولى من رسالتك الكريمة الزاخرة بالصدق والطيبة والحب الكبير.. ولكن ما أن بدأت عيناي تلتهمان الأحرف والكلمات والأسطر حتى وقع ما لم يكن في الحسبان.

لەتیف هەڵمەت، کفری، ناوەندی
شەستەکان

لەتیف هەڵمەت لەگەڵ ئامادەبووانی کۆڕێکی شیعریی خۆیدا، کۆمەڵەی ڕووناکبیری
کوردی لە بەغدا ١٩٧٧.

لەتیف هەڵمەت، حاکم عەزیز، محەمەد حەمەباقیی شاعیر و نووسەر، ژوورەکەی
لەتیف هەڵمەت لە ئوتێل کاسب، بەغدا.

لەتیف هەڵمەت، ئەحمەد شاکەلی، بەغدا، ناوەندی شەستەکان

محەمەد کوردۆ، لەتیف هەڵمەت، کاک فایق، فریاد شوانی

لەتیف هەڵمەت لە کاتی خوێندنەوەی شیعر لە کۆڕێکدا لە یەکەتیی نووسەرانی کورد، سلێمانی ١٩٧٩.

لەتیف هەڵمەت دوای کۆڕێکی شیعری لەگەڵ شیعردۆستاندا، بەغدا ١٩٧٢

لەتیف هەڵمەت ٢٠٠٠

لەتیف هەڵمەت،
٢٠٠٢

لەتیف هەڵمەت، باخی گشتیی سلێمانی ٢٠٠٨

ستار عەبدوڕەحمان شاعیر، د. عەبدولکەریم محەمەد عەلی، لەتیف هەڵمەت، کاک حەمید، کۆمەڵەی ڕووناکبیریی کەرکووک ٢٠٠٤.

لەتیف هەڵمەت، پەیکەرتاشی کوردی سنە زەبائی، بەهرامی وڵەدبەگی نووسەر

لەتیف هەڵمەت، سەعدوڵڵا پەرۆش، د. مارف عومەر گوڵ، چۆمان ١٩٧٥.

لەتیف هەڵمەت، د. عزەدین مستەفا ڕەسوڵ، مامۆستا حوسێن جاف، لە یادی بێخود لە یەکەتیی نووسەرانی سلێمانی، کۆتاییی حەفتاکان.

لەتیف هەڵمەت لەگەڵ ئامادەبووانی کۆڕێکی شیعریی خۆیدا، کۆمەڵەی ڕووناکبیری کوردی لە بەغدا ١٩٧٧.

لەتیف هەڵمەت، سەڵاح محەمەد، ئەرخەوان، قوبادی جەلیزادە، عەبدوڵڵا تاهیر بەرزنجی

لەتیف هەڵمەت، کاک سەباح ڕەنجدەر، سلێمانی تەمووزی ۲۰۱۰.

مامۆستا حەمید خالد شاعیر و نووسەر، لەتیف هەڵمەت، کەرکووک ۱۹۷۱.

# ئەو هۆنراوەیەی
# کە تەواو دەبێ و
# تەواو نابێ

لەتیف هەڵمەت

لەتیف هەڵمەت

# دیوانی منداڵان

شیعر و چیرۆک بۆ منداڵان

بەرگی دووەم

چاپی یەکەم ٢٠٠٥

## پێڕست